# هونەری جەنگ

نوسینی: سون تزو

وەرگێڕانی : مامۆستا شێرکۆ

6/11/2016

ناوی کتێب : هونەری جەنگ

نووسینی : سون تزو

وەرگێڕانی : مامۆستا شێرکۆ



ژمارەی سپاردنی بە کتێبخانەی گشتی

**پێشکەشە بە گشت گیان لەسەردەستانی کورد لە پیاوان و ژنان ( پێشمەرگە ، گەریلا ، شەرڤانان ) لە سەرتاسەری کوردستان .**

***سون تزو* فەرماندەی گشتی سوپا بووە لە پاشایەتی *وو* لە چین ٢٣٠٠ ساڵ پێش ئێستا ئەم پەرتووکەی نووسینوە ، پوختەی شارەزایی خۆی و هاو فەرماندەکانیەتی، گەر چی زۆر کۆنە ئەشێ لەگەڵ سەردەمی ئێستای تەکنەلۆژیای سەربازی گونجاو نەبن بەڵام زۆربەی بنەما سەربازیەکانی تێک دەکەنەوە ، سەرچاوەیەکی گرنگی خوێندنی سەربازییە بە تایبەتی بۆ ئەفسەران و فەرماندەکان.**

**ئەم پەرتووکەپێت دەڵێ : گەر خۆت و دوژمنت ناسی گومان لەسەرکەوتنتدا نامێنێتەوە ، گەر سرووشتی ئاسمان و زەمینت زانی سەرکەوتنی تەواو بەدەست دەهێنیت .**

**بەهیوام بە تێروو تەسەلی بخوێنرێتەوە تاوو توێی خاڵ بە خاڵی بکرێت ، چەند بچووکە هەزاران ئەوەندەش گەورەو بە سوودە.**

**وەرگێڕ**

# ناوەڕۆک

# ١ – نەخشە دانان

**١ – هونەری جەنگ گرنگی ژیان و مانی هەیە بۆ وڵات.**

**٢ – کێشەی ژیان و مردنە ، ڕێگای پاراستنە یا کاول بوونەلەبەر ئەوە جەنگ ئەهێنێ لێکۆڵینەوەو بەدوادا چوون و وردبینی بۆ بکەی ، نابێ بەهیچ جۆرێک فەرامۆش بکرێت.**

**٣ – هونەری جەنگ بە پێنج فاکتەری نەگۆڕ بەڕێوەدەبرێت ، دەبێ جێیان بۆ بکرێتەوە لە بیرکردنەوەدا ، کاتێ دەتەوێ بڕیار لە مەرجەکانی بدەیت لە گۆڕپانی جەنگدا.**

**٤ – ئەمانەن ، ١ ) ڕەفتاری سیاسی ، ٢ ) کەش ، ٣ ) زەوی ، ٤ ) فەرماندە ، ٥ ) شێوازو ڕێک و پێکی .**

**٥ و ٦ – ڕەفتاری سیاسی ئەبێتە هۆی تەباکردنی خەڵک لەگەڵ فەرماندەو بە دووی دەکەون بەبێ گوێدانە ژیان و هەر مەترسیەک.**

**٧- بایەخی شەوو ڕۆژ، ساردو گەرم ، کات و وەرزەکان.**

**٨ – زەوی بریتیە لە هەموو دووریەکان ، گەورەو بچوک ، ترسناک و پارێزراو ، دەشتایی و دەربەندەکان ، هەل یاوەری لە ژیان یا مردن.**

**٩ – فەرماندە دەستی گرتبێ بە چاکی دانایی و دڵسۆزی بەخشندەیی و ئازایەتی و خۆگری.**

**١٠ – بە پێی شێوازو ڕێک و پێکی ، مەبەست شێوەی ڕێکخستنی سوپا لە یەکە دروست ودابەش کردنی پلە سەربازیەکان لە نێو ئەفسەرەکاندا ، چاکردنی ڕێگاو بانەکان کە ڕێگای کۆمەکی سوپان ، توانای ڕێک ڕاگرتنی خەرجی سەربازی.**

١١ – ئەو پێنج فاکتەرە پێویستە زانراوبن لە لایەن هەر فەرماندەیەکەوە، ئەوەی بیان زانێ سەرکەوتو دەبێت و شکست ناهێنێت.

١٢ – کەواتە لە چەندوچونەکانی خۆتدا ، کە هەڵدەستی بە دیاری کردنی دۆخە سەربازیەکان ، لێگەڕێ با ببنە بنچینەی بەراورد کردنەکانت لەم داناییەتدا ببینیتەوە :-

١٣ – ١ ) کام دوو لە فەرماندەکان خاوەنی ئاکاری یاسایین ،

٢ ) کام دوو لە فەرماندەکان بە تواناترن ،

٣ ) کەش و زەوی بۆ کامیان لەبار ترە ،

٤ ) کام لایەنیان بڕیارەکان تەواو تر جێ بە جێ دەکات ,

٥ ) کام سوپایان بەهێز ترە ،

٦ ) کام لایەنیان فەرمانەکان و سەربازەکان مەشقیان باشتر پێ کراوە ،

٧ ) کام لایەنیان بێ لایەنیانەو بە چاکی گرنگی دەدەن بە پاداشت و سزا .

١٤ – بەپێی خوێندنەوەم بۆ ئەو ٧ خاڵە ئەتوانم پێش بینی سەرکەوتن یا شکست بکەم.

١٥ – ئەو فەرماندەیەی بە چاکی گرنگی بدات بە ڕاوێژەکەم و کاری پێ بکات سەر دەکەوێت ، لێی گەڕێ با بە فەرماندەیی بمێنێتەوە ، ئەو فەرماندەیەی بایەخی بە ئامۆژگارییەکانم نەدا شکست دەهێنێت و نموونەی وەک ئەوان دەربکرێن لە خزمەتی سەربازی .

١٦ – لە کاتێکدا کەڵک وەردەگری لە ڕاوێژەکانم ، پشتیش ببەستە بەو هەلە لەبارانەی بۆت ڕێکەوتووە وەک یارمەتی لاوەکی کە لە دەرەوەی نیازەکانت بووە.

١٧ – به پێی گونجانی دۆخەکە ، پێویستە بە نەخشەکەتدا بچیتەوە.

١٨ – جەنگ لەسەر بنەمای فریودانە ( جەنگ فرتوو فێڵە – وەرگێڕ ).

١٩ – کاتێ دەتوانین هێرش بەرین ، خۆ وا نیشانبدەین بێ توانایین ، کاتێ هێزەکانمان بەکار دەهێنین وا نیشانبدەین تەمەڵین ، کاتێ نزیک دوژمن دەبینەوە وا نیشانی دوژمن بدەین دوورین ، کە دووریشین وایان لێ بکەین وا بزانن نزیکین.

٢٠ – ببە بە نێچیری دوژمن و ڕیزەکانی خۆت بە شێواوی نیشان بدە پاشان دوژمن بهاڕە.

٢١ – ئەگەر دوژمن خۆی قایم کردووە لە هەموو لایەکەوە خۆت ئامادەی ڕوو بە ڕوو بوونەوە بکە ، گەر زانیت لە تۆ بەهێزترە خۆتی لێ لادە.

٢٢ – ئەگەر بەرامبەرەکەت زوو هەڵدەچێت ، تەنگی پێ هەڵبچنە با تووڕە بێت، خۆت بەلاواز نیشان بدە تا بەخۆی بنازێت.

٢٣ – هەل بە دوژمن مەدە پشوو بدات، ئەگەر هێزەکانی یەکگرتووبوون هەوڵی دابڕاندنیان بدە لە یەکتر ، لە پشووی خۆشتدا پرزەی لێ ببڕە.

٢٤ – پەلاماری بدە کە ئامادە نیە، لە شوێنێکەوە دەربکەوە پێشبینی نەکردبێت.

٢٥ – ئەم هۆیە سەربازیانە بەرەو سەرکەوتنت دەبات پێش کات مەیدرکێنە.

٢٦ – ئەو فەرماندەیەی سەرکەوتوو دەبێت لە شەڕدا هەستاوە بە زۆر وردەکاری لە ناوەندی فەرماندەییدا پێش شەڕ . فەرماندەی دۆڕاویش ووردەکاریەکی کەمی کردووە پێش شەڕ. کەواتە وردەکاری زۆر بەرەو سەرکەوتنە ، کەمترینی بەرەو شکستە ، بە پێی گرنگی دانت بەو خاڵە ئەتوانی پێشبینی بکەیت کێ سەرەکەوێ کێ شکست دەهێنێت.

# ٢ – هەڵگیرسانی شەڕ

١ – لە دەورانی جەنگدا ، لە گۆڕەپانی شەڕدا هەزار ئارەبانەی جەنگی سووک و خێرای لێیە بۆ هێرش بردن ، ئارەبانەی گەورەشی لێیە بۆ پاڵپشتی ، هەروەها سەد هەزار سەربازی پیادەی زرێ دار، پێداویستی هەزار *لی* ( *لی* یەکەی پێوانەی ماوەیە لە چین) یان پێیە ، بەو پێیە خەرجیەکانی دەرەوەو ناوەوەی بەرەی جەنگ هەروەها پێشوازی میوانەکانی دەوڵەت لە بابەتی سرێش و بۆیاخ ، خەرجیەکانی ئارەبانە جەنگیەکان و زرێ پۆشەکان ، سەرجەمی خەرجیەکان دەگاتە هەزار ئۆنسە زیو لە ڕۆژێکدا ، ئەوەش تێچووی سوپایەکی ١٠٠٠٠٠ کەسیە.

٢ – کە دەکەوینە ناو شەڕەوەو سەرکەوتنەکان دوا دەکەون ، چەکەکان ژەنگاوی دەبن ناپێکن ،پەرۆشی سەربازەکانیش کەم دەکات ، گەر گەمارۆی شارێکت داوە ماندوو دەبیت و پرزەت لێ دەبڕێت.

٣ – دووبارە ئەگەر پەلامارە سەربازیەکەت درێژەی کێشا ، داهاتی دەوڵەت بەیەکسانی لەگەڵ خەرجیەکانی سەربازیدا نامێنێتەوە.

٤ – دوای ئەوەی چەکەکان توانای پێکانیان نەما ، وورەی گشتی ڕوخاو داهێزرایت و هیچت بەدەستەوە نەما، دوژمنانی دەوروبەرت هەلی ڕوخان و داهێزرانت ئەقۆزنەوە ، ئەو دەمە کەسێک زۆریش دانا بێت ناتوانێ بەری ئەو دوو چارە خراپە بگرێت کە لێی قەوماوە.

٥ – بەوجۆرە زۆرمان زانی دەربارەی گەوجی پەلەکردن لە جەنگدا ، بەڵام کارامەیی جەنگی بەند نیە بە دوا خستنی جەنگ.

٦ – لە مێژوودا نەبووە وڵاتێک کەڵکی لە جەنگی درێژخایەن کردبێت .

٧ – قاڵەوەبوی دانا لە کاولکاری درێژکردنی جەنگ ، تێدەگەن لە خێرا کۆتایی هێنان بەجەنگ چیە.

**٨ — سەربازی کارامە چاوەڕێی دوو جار مووچە ناکات وەری بگرێ ، پێداویستیەکانیشی لە دوو جار زیاتر پێ نادرێت.**

**٩ — پێداویستیەکانی شەڕت لەماڵەوە لەگەڵ خۆت بهێنە ، بەڵام خۆراکت لە دوژمنەوە پەیدا بکە ، بەو جۆرە خۆراک و ئاو پاشەکەوت دەبێت بۆ سوپاکەت.**

**١٠ — هەژاری دەوڵەت دەبێتە هۆی ئەوەی سوپا داوای کۆمەک بکات لە شوێنی ترەوە ئەوەش دەبێتە هۆی هەژار کردنی گەل.**

**١١ — لەلایەکی تریشەوە ، شەڕوو پێکدادان لەگەڵ دوژمن دەبێتە هۆی بەرزبوونی نرخ ، کە دەبێتە هۆ بۆ داچۆڕانی سامانی خەڵک.**

**١٢ — کە سامانی خەڵک کۆتایی هات ، ئیتر ئەناڵێنین بەباری قورسی ژیانەوە.**

**١٣ و ١٤ — لەگەڵ فەوتانی سامان و شەکەت بوون ،ماڵی خەڵکی گسکی لێدەدرێ و سێ لە دەی داهاتیان لە دەست دەدەن ، لەولاشەوە خەرجیەکانی دەوڵەت بۆ چاکردنەوەی ئارەبانە جەنگی و زرێ و سەرکڵاوی ئاسنین و تیرو کەوان و سپەرو گۆڕینی ئەسپە شەکەتو گاکانی بار هەڵگر، خەرجی هەموو ئەوانە چوار لە دەی داهاتی گشتی دەبات.**

**١٥ — بەو جۆرە ، فەرماندەی دانا پشت دەبەستێت بە دوژمن وەک سەرچاوەی خۆراک و پێداویستی ، یەک ئارەبانەی پێداویستیەکان لە دوژمن بەرامبەرە بە ٢٠ ئارەبانەی هێڵەکانی پشتەوەیە ، یەک *پیکل* (پیکل بەرامبەرە بە ٦٥،٥ کیلۆ گرامە) لە خواردنی دوژمن بەرامبەرە بە ٢٠ لە دەبۆکانی دەوڵەتە.**

**١٦ — ئێستا بۆ جەنگین دژی دوژمن پێویستە توڕەیی سەربازەکان بورووژێندرێ ، هەروەها ڕوونی بکەینەوە بۆ ئەبێ سەرکەوین بەسەر دوژمندا ، پێویستە پاداشتیش بکرێن .**

١٧ – لەبەر ئەوە کە دەست بەسەر ١٠ یا زیاتر ئارەبانەی جەنگیدا دەگیرێ ، پاداشتی یەکەم کەس بکرێت کە ئارەبانەی یەکەمی گرتووە ، پێویستە ئاڵاکانی دوژمنی لێ بکرێتەوەو ئاڵای خۆمانی پیا هەڵبکرێت ، پێویستە تێکەڵی ئارەبانەکانی خۆمان بکرێن و بەکار بهێنرێنەوە ، پێویستە هەڵس و کەوتی باش ئەنجام بدرێت لەگەڵ دیلەکان و ژیانیان بپارێزرێت.

١٨ – ئەمەیە پێی دەڵێن بەکارهێنانی دەستکەوتەکان لە دوژمنی شکست خواردو بۆ بەهێز کردنی هێزو توانای خۆ.

١٩ – کەواتە با خەمی یەکەم و گەورەمان لە جەنگدا سەرکەوتن بێت ، نەک درێژەدان بە پەلامارە سەربازیەکان .

٢٠ – بەو جۆرە ئەتوانین بڵێین فەرماندەی سوپا بڕیاردەری چارەنووسی گەلە ، ئەو پیاوەیە کە پشتی پێ دەبەسترێ کە نەتەوە لە ئاشتیدایە یا لە مەترسی.

# ٣ – هێرش کردن بە فێڵی سەربازی

١ – بە پێی بەکار بردنی هونەری جەنگی ، باشترین شتێک ئەوەیە تەواوی وڵاتی دوژمن بە باش وەربگرین ، وێران کردنی بە تەواوی زۆر باش نیە ، چاکتر وایە دەست بەسەر تەواوی سوپاکەیدا بگیرێت باشترە لە وێران کردن ، بۆ دەستگیر کردنی یەکەیەکی سەربازی لێک دابڕاندنیان لە یەکتر باشترە لە وێران کردنیان.

٢ – کەواتە جەنگین و سەرکەوتن لە شەڕدا شانازی نیە ، بەڵکوو شانازی بریتیە لە تێک شکاندنی بەرگری دوژمن بەبێ شەڕ.

٣ – باشترین کارێکی فەرماندایەتی ئەوەیە ببێتە کۆسپ لەبەردەم نەخشەکانی دوژمن بە دژە هێرش کردن ، هەر وەها نەهێڵێ هێزەکانی دوژمن

یەک بگرنەوە پاشان هێرش کردنە سەر دوژمن لە گۆڕەپانی جەنگدا ، خراپترین سیاسەتیش گەمارۆدانی ئەو شارانەیە کە دیواری بەرزیان هەیە.

٤ — پێچەوانەی یاسا نیە گەمارۆدانی ئەوشارانە بدرێ کە دیواری بەرزیان هەیە گەر بشێ، ئامادەکردنی ئەو قوللانەی کە دەجووڵێنرێن هەروەها ئامرازە جەنگیەکانی تایبەت بەوە سێ مانگ دەخایەنێ ، هەروەها ئەو بارستاییە خۆڵانەی هەڵدراونەتەوە لە پێش دیوارەکان ئەویش سێ مانگی تر دەخایەنێت.

٥ — ئەو فەرماندەیەی کە ناتوانێ دان بەخۆیدا بگرێت ، دەنگی سوپاکەی دەدات بۆ هێرش بردن وەک شارە مێروو پێش ئەوەی کاتی هاتبێ، ئەنجام سێ یەکی سوپاکەی بەسەر بڕین دەدات ، شارەکەش بە پارێزراوی دەمێنێتەوە، ئەوە هەندێک کارەساتی گەمارۆدانن.

٦ — فەرماندەی سەرکەوتوو ئەوەیە هێزەکانی دوژمن تێک بشکێنێ بەبێ شەڕ. شار دوای شار دەگرێ بێ گەمارۆدان و فەرمانڕەوایەتیەکەی دەڕووخێنێ لە گۆڕەپانی شەڕدا.

٧ — بەبێ ئەوەی زیان بە هێزەکەی گەیشتبێ ، گومان دەخاتە ناو هێزو توانای دوژمنەوە بێ ئەوەی سەربازێکیش لە دەست بدات سەرکەوتنیش بە دەست دەهێنێ ، ئەوەیە ڕێگای هێرشی فێڵاوی.

٨ — لە یاسای جەنگدا ، کە ڕێژەی هێزەکانت ١٠ بەرامبەر ١ ی دوژمن بوو گەمارۆی بدە ، ئەگەر ٥ بە ١ بوو یەکسەر پەلامار بدە ، ئەگەر دوو کەڕەت بوو سوپاکەت بکە بە دوو بەشەوە ، بەشێکی بۆ پەلاماردان و بەشەکەی تری بۆ فرو فێڵی جەنگی.

٩ — ئەگەر وەک یەک بووین تاتوانامان بوو شەڕ بکەین کارامەکەیان سەردەکەوێ گەرکەمێک بێ هێزتر بووین باشترە خۆ لە شەڕ نەدەین ، گەر جیاوازیەکە زۆر زۆر بوو باشتر وایە لە دوژمن هەڵێی.

١٠ – بەو جۆرە هێزە بچوکەکە لەوەیە شەڕێکی چاک بکات و درێخی نەکات بەڵام لە کۆتاییدا هێزە گەورەکە دەستگیری دەکات.

١١ – ئێستا با بڵێین فەرماندە قەڵای دەوڵەتە ، گەر ئەو قەڵایە لە هەموو لایەکەوە تەواوە دەوڵەت بەهێز دەبێ ، خۆ ئەگەر خەوشی هەبێ دەوڵەتیش لاواز دەبێ.

١٢ – بە سێ ڕێگا فەرمانڕەوا بەڵا بەسەر سوپاکەیدا دەهێنێ :

١٣ – ١ ) فەرمان کردن بە جوڵانی سوپا یا پاشەکشە ،ئاگای لەوە نیە سوپاکەی گوێ ڕایەڵی نین. ئەمە پێی دەڵێن دەستەپاچە کردنی سوپا.

١٤-٢) فەرماندەیی کردنی سوپا بەهەمان شێوەی فەرمانڕەوایەتیەکەی ، فەرامۆش کردنی مەرجەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەی سوپا بەهۆی بێ ئارامی و بێ ورەیی سەربازەکانی.

١٥ – ٣ ) دانانی ئەفسەران بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازی و پشت گوێ خستنی بنەماکانی سەربازی بەپێی دۆخی لە ئارادایە. ئەوەش بێ متمانەیی لای سەربازەکان درووست دەکات.

١٦ – کاتێ سەربازەکان بێ ئارام دەبن و متمانەیان بە فەرمانڕەوا نامێنێت ، گیروگرفت لە لاکانی ترەوە سەرهەڵئەدات ، زۆر بە ئاسانی سوپا تووشی ئاژاوە دەبێت ، سەرکەوتن دەخرێتە ئەولاوە.

١٧ – پێنج بنچینە هەیە بۆ سەرکەوتن :

١ ) ئەوەی سەردەکەوێت دەزانێ کەی شەڕ دەکات کەی شەڕ ناکات.

٢ ) ئەوەی سەردەکەوێت دەزانێ چۆن مامەڵە لەگەڵ هێزە جیاوازەکاندا دەکات: گەورەو بچوکیان .

٣ ) ئەوەی سەردەکەوێت سوپاکەی یەک ورەیان هەیە لە هەموو ئاستەکاندا لە سەربازەوە تا دەگاتە فەرماندەکان .

٤ ) ئەوەی سەردەکەوێت ئەوەیە کە خۆی ئامادە کردووە و چاوەڕێی خافڵ گیر کردنی دوژمنە.

٥) ئەوەی سەردەکەوێت فەرماندەیەکە هەموو دەسەڵاتەکانی هەیە ، فەرمانڕەوا دەست وەرناداتە کاروباری.

١٨ – کەواتە کە خۆت و دوژمنت ناسی نابێ بترسی لە ئەنجامی سەدان شەڕ ، ئەگەر هەر خۆت ناسی دوژمنت نەناسی هەر سەرکەوتنێک شکستیشی بەدوادا دێت ، گەر نەخۆت بناسی و نەدوژمن لە هەموو شەڕێکدا شکست خواردووی.

# ٤ – جێ گۆڕکێی تاکتیکی

١ – جەنگاوەرە دێرین و کارامەکان خۆیان بەدوور گرتوە کە نابێت توشی شکست بێن ، لە چاوەڕوانیدان تا هەلی سەرکەوتنیان بەسەر دوژمندا دەست بکەوێت.

٢ – پاراستنی خۆمان بۆ شکست نەهێنان ئەکەوێتە سەر خۆمان ، شکستی دوژمن خۆی بەسەرخۆی دێنێت .

٣ – باشترین جەنگاوەریش خۆی خۆی دەپارێزێ لە شکست نەهێنان ، بەڵام ناتوانێ جەخت لەوە بکاتەوە دوژمن بشکێنێ .

٤ – لەوانەیە بزانی چۆن دوژمن دەشکێت بەڵام توانای بەدەست هێنانی پێداویستیەکانت نەبێت .

٥ – خۆ قایم کردن دژی شکست پێویستی بە تاکتیکی بەرگری هەیە، بەڵام توانای تێک شکاندنی دوژمن واتا هەل قۆزتنەوە .

٦ — وەرگرتنی دۆخی بەرگری پێویستی بە هێزی تەواو نیە ، بەڵام هێرش بردن پێویستی بە هێزی زۆرە .

٧ — فەرماندەی سەربازی وریا لە بەرگریدا خۆی لە زەوی حەوتەمدا (شوێنێکی نهێنی) پەنا داوە. فەرماندەی سەربازی لە هێرشدا وەک بروسکە خۆی پیادا دەکات وەک ئەوەی لە ئاسمانی نۆهەمەوە هاتبێ. لایەنی یەکەم خۆپاراستنمان بەدەست خۆمانە ، لایەنی دووهەم توانامان لە بەدەست هێنانی سەرکەوتنی تەواودا.

٨ — بینینی سەرکەوتن لە لایەن کەسێکی ئاساییەوە ئەو پەڕی پەسندی نیە .

٩ — ئەوپەڕی پەسندی ئەوە نیە بجەنگی و شکست بێنی و دەوڵەت بڵێت چاکت کردو دەست خۆشیت لێ بکات.

١٠ — دۆزینەوەی تاڵە موویەک لە پایزدا زرنگی ناگەیەنێ ، بینینی خۆرو مانگ چاوتیژی ناگەیەنێ ، گوێ لە هەورە گرمە گوێ سوکی ناگەیەنێ .

١١ — پێشینان باسی جەنگاوەرە کۆنە لێهاتووەکانیان دەکرد نەک هەر سەرکەوتنیان بەدەست دەهێنا بەڵکو سەرکەوتنیان ئەنواند زۆر بە ئاسانی .

١٢ — بەو پێیە سەرکەوتنەکان ناوبانگێکی باشی بۆ درووست دەکرد ، سەر ئەنجامی داناییە بێ وێنەکەشی ڕێزیش بۆ ئازایەتیەکەی دادەنرا.

١٣ — لە شەڕەکانیدا سەردەکەوێت چونکە هەڵەیەکی نەکردووە ،هەڵە نەکردن جەخت لە سەرکەوتن دەکاتەوە ، ئەوەش تێک شکانی دوژمن دەگەیەنێ لە ڕاستیدا.

١٤ — جەنگاوەری کارامە لە شوێنێک دەوەستێ کە شکست زەفەری پێ نەبات ، هەلی هەڵکەوتووش بە فیڕۆنادا بۆ شکستی دوژمن.

١٥ — له جەنگدا سەرکردەی ستراتیژی سەرکەوتوو بۆ شەڕ دوای ئەوەی سەرکەوتنی زامن کردووە ، ئەوێک کە سەرکەوتنی یەکەمی زامن کردوە سەرکەوتنەکانی تر چاوەڕێی دەکەن .

١٦ — فەرماندەی کارامەی سەرسەخت ڕەچاوی یاسای ڕەوشت دەکات ، بە توندی دەستی گرتووە بە سیستەمی گشتیەوە، بەوپێیەی دەتوانێ سەرکەوتن بخاتە ڕکێفی خۆیەوە.

١٧ — له ڕوانگەی سەربازیەوە توخمەکانی هونەری جەنگ ئەمانەن:

١ ) پێوانە کردن ، ٢) خەمڵاندن و چەندایەتی ، ٣) ژمێریاری ، ٤) تاوو توێ کردنی بەخت یاوەر بوون ، ٥) سەرکەوتن .

١٨ — پێوانەکردنی زەویەکەی خۆت ، خەمڵاندنی چەندایەتیەکەیە بۆ پێوانە ، ژمێریاری بۆ خەمڵاندنی چەندایەتی ، تاوو توێی بەخت بۆ ژمێریاری ، سەرکەوتن بۆ تاوو توێ کردنی بەخت .

١٩ — سوپای سەرکەوتوو بەرامبەر بە شکست خواردوو وەک سەنگێکە بەرامبەر دەنکە گەنمێک.

٢٠ — هەڵمەتی هێزی سەرکەوتوو وەک هەڵقوڵانی ئاوێکە بۆ قووڵایی.

# ٥ — سوپا له پێشڕەویدا

١ — دێینە سەرباسی خێوەت هەڵدانی سوپا و چاودێری کردنی نیشانەکانی دوژمن ، بەخێرایی سەرکەوتنی شاخەکان و خۆ مت دان لە کەناری شیوو دۆڵەکاندا .

٢ — چادرهەڵدان لە شوێنێکی ڕوو لە خۆر، زۆر سەرمەکەوە بۆ ئەوەی بتوانی شەڕ بکەیت، سەربەرەو ژوور هێرش مەکە.

٣ – کە زێیەکت بڕی دوور کەوەرەوە لێی .

٤- پەلاماری دوژمن مەدە لە کەناری زێدا لێی گەڕێ با نیوەی ببڕێت و لە دەشتیەکدا پەلاماری بدە.

٥ – ئەگەر دوو دڵی لە شەڕ کردن ، نابێت ڕوو بە ڕووی لەشکرێک بیتەوە لە نزیک زێ کە دەیەوێ بپەڕێتەوە.

٦- کەشتیەکەت بخەرە لای سەرەوەی دوژمن و ڕوو لەخوار ، بەرەو سەری ڕوبار مەڕۆ بۆ ڕوو بە ڕوو بوونەوەی دوژمن ، باشترە لە زێدا نەجەنگی.

٧ – لە تێپەڕین بە زۆنگاوە سوێرەکاندا ، گرنگی بە زوو تێپەڕین بدە لێی بێ دواکەوتن.

٨ – ئەگەر زۆرت بۆ هێنرا بجەنگیت لە زۆنگاوە سوێرەکاندا پێویستە ئاوو گیاتان لێوە نزیک بێت و پشت بەدارەوە بدەی ، شەڕی زۆنگاوی سوێر خێرێکی تێدانیە.

٩ – لە ناوچەیەکی وشکانیدا تەپەیەکی بڵند دیاری بکە بەلای ڕاستەوە نزیک لە پشتەوەت ، لەوانەیە مەترسیەکە لە پێشەوە بێت ، پشتەوەت پارێزراوبێت ، شوێنی زۆر تەختانیش باش نیە.

١٠ – ئەمە چوار لقی زانیاری بە سوودن بۆ سوپا کە یارمەتی ئیمپراتۆری زەردی کرد چەندین شانشین ببەزێنێت.

١١ – هەموو سوپاکان شوێنی بڵندیان پێ پەسندە نەک نزمایی هەروەها بەرخۆر بێت نەک نسێ .

١٢ گەر دەتەوێ وریای سەربازەکانت بیت ، لە زەویەکی ڕەقدا چادر هەڵدە سوپاکەت پارێزراو دەبێت لە زۆربەی نەخۆشیەکان ئەوەش یارمەتی سەرکەوتن دەدات .

١٣ – كه دێيته سەر گردێک يا هەڵدێرێک ، بچۆره بەرخۆرەکەی ، لێژاييەکەی لەپشتەوەی لای ڕاستەوە بێت ، به قازانجی سەربازەکانت سروشتی شوێنەکه دياریٔ بکه .

١٤ – دوای هەر بارانێکی زۆر ڕوبارەکان هەڵدەستن چاوەڕێ بکه تا دەنيشنەوه .

١٥ – ناوچه هەڵدێرو لافاويەکان و چاڵ و چۆڵه قوڵەکان و شوێنه تەنگەبەرەکان و

دارستاناويه چڕەکان و زۆنگاوو قڵيشه بەستەڵەکەکان دەبێ بەزووترين کات بەجێ بهێڵرێن .

١٦ – کاتێ دەمانەوێ دوورکەوينەوه لەو شوێنانه ، هەوڵ بدەين دوژمن بچێته ئەو شوێنانەو پاشەڵيشيان لەوێ بێت.

١٧ – گەر له دەوەرووبەری چادرگاکەت تەپۆلکەو زۆنگاوی زەلاوی گۆلی بێ ئاوی قاميشەلانی و دارستانی لێ بوو پێويستە سەرنجی بدرێتێ و بپشکندرێ ، ئەو شوێنانه گومانی کەسانی دزه کەرو سۆسه کەری لێبێت بۆسەيان دانابێ بۆ زەبر وەشاندن.

١٨ – کاتێ دوژمن نزيکەو کش و ماته ، هەروەها پشتی بەستوه به توانا سروشتيەکەی که هەيەتی .

١٩ – کاتێ دابڕاوەو تورەيه له شەڕ ، دوو دڵه له پێشڕەوی لاکەی تر.

٢٠ – ئەگەر شوێنی چادرگاکەی ئاسانه بۆ چوونه ژوورەوه ، لوقمەيەکی چەوره.

٢١ – هەر جوڵەيەک له دارستانەکەوه ئەوه ئەگەيەنێ دوژمن له پێشڕەوی دايه، دەرکەوتنی ژمارەيەک شتی نەزانراو له ناوەڕاستی زەبەنه گياوه وا ئەگەيەنێ دوژمن ئەيەوێ بمانخاته گومانەوه.

٢٢ – جۆری هەڵفڕینی باڵندەکان نیشانەی بۆسەیە ، ترس و ڕەوی گیانداران نیشانەی بەڕێوەبوونی پەلامارێکی لە پڕە.

٢٣ – کاتێ تەپووتۆز دەچێت بە ئاسماندا ، ئەوە نیشانەی هاتنی ئارەبانەیە ، کە تەپووتۆزەکە نزمە بەڵام بە شوێنێکی بەریندا بڵاوەدەکات نیشانەی گەیشتنی پیادەیە. کە دەرکەوتن دەستە دەستە بۆ ئاراستەی جیاواز ، ئەوە ئەگەیەنێ چەند دەستەیەک نێردراون بۆ کۆکردنەوەی داری ئاگر کردنەوە ، کە هەندێک تەپوو تۆز وەک هەور دەرکەوت نیشانەیە بۆ چادر هەڵدان .

٢٤ – هەندێ قسەی پڕوپوچ و زیاتر خۆ ئامادەکردن وا دەرەخەن کە دوژمن ڕوو لە پێشڕەوی کردنە. زمانی زبرو توندو تیژی فەرماندەش بۆ پەلاماردان و هێرش کردن نیشانەی پاشەکشە کردنە .

٢٥ – کە ئارەبانە بچوکەکان لە ڕاست و چەپەوە شوێنی خۆیان دیاریکرد ئەوە نیشانەی خۆ ئامادەکردنی دوژمن تەواو بووە.

٢٦ – پێشنیاری ئاشتی بەبێ مۆرکردنی پەیمان نامە پیلاگێڕیە.

٢٧ – کاتێ کە زۆر لە پلەدارەکان ئەپێکرێن ، وا ئەگەیەنێ دۆخەکە خراپە.

٢٨ – کە بینران هەندێک لە پێشڕەویدان و هەندێک پاشەکشە دەکەن ، ئەوە فریودانە.

٢٩ – کاتێ سەربازەکان بەسەر نێزەکانیاندا پاڵیان داوەتەوە ، ئەوە نیشانەی کەمیە لە خۆراکدا.

٣٠ – گەر کەسانێک نێردران بۆ ئاو هێنان و خۆیان لە پێشدا دەستیان بە ئاو خواردنەوەکرد دیارە سوپاکە تینییە.

٣١ – گەر دوژمن بیەوێ پێشڕەویەک بکات ، هەوڵێکی زۆری بۆداو بەدەستی نەهێنا ، وا ئەگەیەنێ سەربازەکانی ماندوون .

٣٢- ئەگەر باڵندە لەهەر شوێنێک کۆمەڵەیان کرد ئەو شوێنە ئاوەدان نیە ، قەڵەباڵخی و جریوەی زۆروو توورە دەرەکەون .

٣٣ — ئەگەر شێواوییەک لە چادرگاکەدا هەبوو ، فەرماندەکانیش لاواز بوون و ئاڵاکانیش جێگۆڕکێیان پێکرا ئاژاوەیەک هەیە ، ئەگەر ئەفسەرەکانیش تووڕەبن واتە پیاوەکانیان دڵ گران کراون.

٣٤ — کاتێ سوپا ئەسپەکانیان تێر ئالیک کردوو گاو گۆتاڵەکانیان کوشتەوە بۆ خواردن و چیتر مەنجەڵەکانیان نەخستەوە سەر ئاگردان ، وا نیشان دەدات نەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ چادرگاکەیان و بڕیاریان داوە بجەنگن تا مردن.

٣٥ — بینینی سەربازەکان بەیەکەوە چپەکردن و قسەکردن بە نزمی،بێزاری دەربڕینی نێوانیانە .

٣٦ — دووبارە پاداشت کردنەوە نیشانەی کۆتا هاتنی سەرچاوەکانیەتی ، زۆر سزادانیش گومانی لێ دەکرێت دۆخەکە بەرەو بێزاری و خراپی بەرێت .

٣٧ — بەدەست پێکی هەڕەشەوە ، پاشان بتۆقی لە ژمارەی دوژمن ، ئەوە ئەگەیەنێ هیچ ئاگاییەکی هەواڵگرییان نیە.

٣٨ — کە شاندێک نێردراو لە زمانی خۆیانەوە ڕێز نوێنرا ، ئەوە نئشانەی نیازی ئاگر بەستن.

٣٩ — ئەگەر هێزەکانی دوژمن پێشڕەویان کردوو بۆ ماوەیەکی زۆر لە ڕومان وەستان و نەهاتنە شەڕەوە یا بەو جۆرە دووبارەیان کردەوە ، دۆخەکە وریای و ئامادەبوونی دەوێ.

٤٠ — ئەگەر هێزەکانمان بە ژمارە لە دوژمن زیاتر نەبوو ، بەڵام ئەوان ژمارەی پێویستیان کەم نیە ، وا ئەگەیەنێ نەتوانین ڕاستەوخۆ پەلاماریان بدەین ، ئەوەی پێمان دەکرێ هێزەکانمان چڕ بکەینەوەو لە نزیکەوە چاوەدێریان بکەین تا خۆمان بەهێز دەکەین .

**٤١ — ئەو کەسەی هیچ تەگبیرێک ناکات و ئەیەوێ لە سەر ڕۆشنایی ڕکابەرەکانی کەڵک وەربگرێ بێگومان دەستگیر دەکرێت .**

**٤٢ — ئەگەر سەربازە سزا دراوەکان پێشتر پەیوەندیان نەکردبێت و نەیان سەلماندبێت ئەوا مل کەچ نابن ، پاشتر مل کەچی کەڵکێکی نیە ، ئەگەر سەربازەکان پەیوەندیان پێوەکردی و سزا نەدران ، هێشتا هەر بێ سوود دەبن.**

**٤٣ — پێوەستە ڕەفتاری مرۆڤانەیان لەگەڵدا بکرێت ، بەڵام بخرێنە ژێر دیسپلنێکی توندەوە ، ئەوە باشترین ڕێگای سەرکەوتنە.**

**٤٤ — ئەگەر مەشق کردنی سەربازەکان بە فەرمان سەپاندن بێت، ئەوا سوپاکە دیسپلینێکی باشی دەبێت ، گەر وا نەبێت دیسپلینێکی خراپی دەبێت .**

**٤٥ — ئەگەر فەرماندە متمانە بە سەربازەکانی بدات و سووریش بێت لەسەر مل کەچیان بۆی ، دوو لایەنە دەستی پێوە گرتووە.**

# ٦- وزە

**١ — سەرۆکاری هێزێکی گەورە هەمان ئەو بنەمایانەیە کە بۆ هێزێکی بچوک بەکار دەهێنرێ : تەنها پرسی جیاوازی ژمارەکەیانە.**

**٢ — جەنگین لە سوپایەکی گەورە لە سایەی فەرمانی تۆدا بە هیچ جۆرێک جیاوازی نیە لە جەنگیندا لە سوپایەکی بچوکدا ، تەنها پرسی بەکار هێنانی نیشانەو هێماکانی جیاوازە.**

**٣ — بۆ دڵنیا بوون لەوەی سوپاکەت دەتوانێ خۆی بگرێ لە ژێر باری پەلاماری دوژمن و ورەیان نەڕووخێت ، کاریگەری ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی مانۆر لەوەدایە.**

٤ — کاری گەری سوپاکەت وەک بەرکەوتەی بەرداش بێت بەهێلکە، ئەوەش جێ بەجێ دەبێ بە زانینی خاڵە لاوازو بەهێزەکان.

٥ — لە هەموو جەنگەکاندا ئەتوانرێ شێوازی ڕاستەوخۆ بگیریتە بەر بۆ بەشداری کردن لە شەڕکان ، بەڵام ناڕاستەوخۆ بۆ زامن کردنی سەرکەوتنە.

٦ — تاکتیکە ناڕاستەوخۆکان لەبن نایات ، وەک ئاسمان و زەوییە ئەوسەری نیە، وەک ڕێچکەی ڕوبارەکان و هەڵقوڵانی کانیاوەکانە ، وەک مانگ و خۆرە ئاوا دەبن و هەڵدێنەوە ، وەک چوار وەرزی ساڵە دەڕۆن و دێنەوە.

٧ — تەنها پێنج جۆری نۆتەی موزیک هەیە ، بە تێکەڵ کردنیان بێ کۆتا پارچە ئاوازی موزیکیان پێ دادەنرێ.

٨ — هەر پێنج ڕەنگی بنچینەیی هەیە ( شین ، زەرد ، سور ، سپی ، ڕەش ) بە تێکەڵ کردنی ئەو ڕەنگانە پلەکانی ڕەنگیت پێشکەش دەکات چۆنت دەوێت وات دەداتێ ،

٩ — تەنها پێنج چێژی بنچینەیی هەیە ( ترش ، تیژ ، سوێر ، شیرین ، تاڵ ) بەتێکەڵ کردنیان تام و چێژی تایبەت دەبەخشن .

١٠ — لە گۆڕەپانی جەنگدا ، دوو ڕێگای هێرش بردن هەیە ، ڕاستەوخۆ ، ناڕاستەوخۆ . بە تێکەڵ کردنی هەردووکیان بێ کۆتا مانۆڕی لێ درووست دەبێت.

١١ — بەکار هێنانی ڕێگای ڕاستەوخۆ بۆ گەیشتن بە ڕێگای ناڕاستەوخۆ ، هەروەها ڕێگای ناڕاستەوخۆ دەت گەیەنێتە ڕاستەوخۆ وەک یەکە لە بازنەیەکی داخراودا سوڕانەوە بێ ئەوسەرە ، بەو جۆرە ناتوانی بگەیتە ئەوسەری ئامانجە شیاوەکان لە تێکەڵ کردنی ئەو دوو جۆرە ، بێ کۆتایین.

١٢ — هێرشی سەربازان وەک لافاو وایە هەرچی بکەوێتە ڕێی ڕایدەماڵێ.

١٣ – بڕیاری دروست له فەرماندەوە وەک هەڵمەتی ئەو هەڵۆیەیە کە دەیبات بۆ نێچیرەکەیی و دەیگرێ .

١٤ – بۆیە جەنگاوەری هەڵمەت بەر تۆقێنەرە لە هێرشداو دواکەوتنی نیە لە بڕیاردا.

١٥ – ئەتوانین وزە بچوێنین بە توندی کەوانە لە تێگرتنی تیردا، بڕیاریش بچوێنین بە ساتی بەردانی تیرەکە بەرەو ئامانجەکە.

١٦ – لە گەرمەی هەراو هوریای شەڕو شێواویدا ، ئاژاوەیەک دەرەکەوێ ، بەڵام زۆر گەورە نیە . لەو هەموو بەیەکا هاتنە بێ سەرو بەری هەیە ، ئەشێ هێزەکەت پاش و پێشی نەبێ ، لەگەڵ ئەوەشدا خۆگرە بەرامبەر بە شکست .

١٧ – خۆ دەرخستن بە بوونی ئاژاوەی درۆزنانە ، پێویستی بە دۆخی دیسپلینی تەواو وەک مەرجی بنچینەیی ، خۆ نیشاندان بە ترسنۆک پێویستی بە ئازایەتیە ، هەروەها خۆ دەرخستن بە لاوازی پێویستی بە هێز و توانایی هەیە.

١٨ – شاردنەوەی دیسپلین لە ژێر پەردەی ئاژاوەدا چاک دابەشکردنی یەکەکانی سوپایە ، هەروەها شاردنەوەی ئازایەتی بە ترسنۆکی توانایەکی گەورەی گەرەکە ، هەروەها شاردنەوەی هێز لە پەنا لاوازیەکی درۆزنانەدا لە مانۆڕە تاکتیکیەکانەوە هاتوە.

١٩ – ئەوەی خۆی بە کارامە دەزانی و یاری بە دوژمن دەکات، پێویستە وریای ڕووە فێڵاویەکەی خۆی بێت و بیپارێزێ ، کە دوژمن پشتی پێ بەستووە ، قوربانی بدات بە هەندێک شت بۆ ئەوەی هەڵمەتی بۆ بەرێت .

٢٠ – نانەوەی چەشە بۆ دوژمن بۆ تێوەگلانی، تۆش بە باشترین جەنگاوەرەکانت خۆت بۆی مەڵاس داوە.

٢١ – باشترین جەنگاوەر ئامانجی پەکخستنی هێزەکانە ، ژمارەی زۆریشی ناوێت ، بەو ڕێگایە دەتوانێ گونجاو ترین کەسەکان هەڵبژێرێ و کەڵک لە یەکخستنی هێزەکان وەربگرێ.

٢٢ – بە کەڵک وەرگرتن لە یەکخستنی هێزەکان ، جەنگاوەرەکان وەک بەردی خڕی خلۆرکراوە لە بەرزیەوە لە هیچ ناگەڕێتەوە لە تەلانێکەوە فڕێ بدرێتە خوارەوە، سرووشتی بەرد وەستانە لە شوێنی خۆی گەر ڕووبەرەکە دەشت بێت، گەر بەردەکە چوار گۆشە بێت لە تەلانیشەو بێت زوو دەوەستێت ، بەردی خڕ خێراتر و خێراییەکەی زیاترە .

٢٣ – لە ئەنجامدا ، وزە لە جەنگاوەرە ئازاو قارەمانەکانەوە دەردەکەوێ ، وەک ئەو بەردە خڕە وایە کە لە پۆپەی شاخێکەوە خلۆر دەبێتەوە کە هەزاران مەتر بەرزە ، ئەوەیە بابەتی وزە.

# ٧ – خاڵە لاواز و بە هێزەکان

١ – کێ زوتر بگاتە گۆڕەپانی جەنگ و چاوەڕێی دوژمن بکات حەساوەیە ، ئەوەی دواتر دەگات و تاوی شەڕ دەدات ماندوە.

٢ – جەنگاوەری چاک ئەوەیە دوژمن بانگ بکات بۆ شەڕ و نەهێڵێت ئەو بانگ بکرێت لە لایەن دوژمنەوە.

٣ – بۆ ئەوەی زیانی پێنەگات ، ئەتوانێ دوژمن سەغڵەت بکات و وای لێبکات لێی نزیک نەکەوێتەوە.

٤ – گەر دوژمن پشوو وەردەگرێ دەتوانرێ بێزار بکرێت، گەر خۆراکی باشی پێدەگات هەوڵ بدرێت برسی بکرێت ، کە دەیەوێ بە ئارامی خێوەتگای هەڵ بدات زۆری بۆ بێنە بجوڵێ.

٥ — دەرکەوە لەو شوێنانەی کە پێویستە دوژمن بە خێرایی بەرگری لێ بکات ، بە خێرایی برۆ ئەو شوێنانەی کە نابێ لێی بیت.

٦ — هەر سوپایەک دەتوانێ ڕێگای دوور ببڕێت بێ دوودڵی و کۆسپ کە دوژمنی لێ نیە.

٧ — گومانی تێدا نیە سەردەکەوی گەر هێرش بەری بۆ ئەو شوێنانەی پاسەوانی ناکرێت ، هەروەها دڵنیاش دەبیت لە بەرگری کردنت بۆ ئەو شوێنانەی ناتوانرێ هێرشی بکرێتە سەر.

٨ — فەرماندەی کارامە لە هێرشدا نازانێ دوژمنەکەی بەرگری لەچیدەکات، هەروەها لەبەرگری کردنیشدا نازانێ دوژمنەکەی کەی و چۆن هێرش دەهێنێ.

٩ — ئەی خوداوەندی هونەری وردەکاری و نهێنی ! لە تۆوە فێردەبین وون بین، لەبێدەنگیتەوە ، بەوانەتەوە چارەنوسی دوژمن دەکەوێتە بەر دەستمان.

١٠ — ئەتوانی پێشڕەویەکی وا بکەیت نەتوانرێ ڕێگریت لێ بکرێت، ئەگەر مەبەستت خاڵە لاوازەکانی دوژمن بێت ؛ ئەتوانی پاشەکشە بکەیت و خۆ دەرباز بکەیت لە مەترسیەکانی دوژمن بە جوڵانەوەی خێرا تر لە هی دوژمن.

١١ — ئەگەر دەمانەوێ بجەنگین ، ئەتوانین وا لە دوژمن بکەین بێتە جەنگەوە تەنانەت ئەگەر لە پشتەوەی سەنگەرو خەندەقە قوڵەکانیشیان بن ، ئەوەی پێمان بکرێت هێرش بکەینە سەر ئەو شوێنانەی ناچاریان دەکات بێنە دەرەوە بۆ ئەوەی بەرگریان لێ بکات.

١٢ — گەر نامانەوێ بجەنگین ، بی خەڵەتێنین بە شوێنەواری چادرگاکەمان ، تەنها دەتوانین بە فڕێدانی شتی وا لە ڕێگادا لە عەقڵی دوژمندا نەبێت.

١٣ — بە ئاشکراکردنی نیازو شوێنەکانی دوژمن و ئێمەش خۆمان لێ پەناداون ، ئەتوانین هێزەکانمان بە کۆکراوەیی و چڕی بهێڵینەوە ، لە هەمان کاتدا پێویستە دوژمن لێک دابېڕدرێت.

١٤ — ئەتوانین هێزێکی یەکگرتوو درووست بکەین ، هێزی دوژمنیش لێکدابڕین، ئەوسا ئێمە کۆکراوەیەکی یەکگرتوو دوژمنێکی کەرت و پەرت ، ئەمانکاتە زۆرینەیەکی یەگرتوو ئەوانیش کەمایەتیەکی پەرت.

١٥ — ئەگەر ئێمە توانای هێرشمان هەبێ بەسەر هێزێکی لە خۆمان بێ هێزتر دوژمنەکەمان ئەکەوێتە دۆخێکی ترسناک و تەنگانەی واوە ئیرەیی پێ نابرێ.

١٦ — ئەو شوێنەی هێرشی بۆ دەکەین نابێ زانراو بێت لای کەس ، ئەو کاتە دوژمن ناچار دەبێت لە چەند شوێنێکەوە ئامادەکاری بکات ، لەو دۆخەدا هێزەکەی پەرتە لە چەند شوێنێک ، ڕێژەی هێزەکانی ئێمەش لەو شوێنانەدا کە ڕووبەڕوویان دەبینەوە کەمن.

١٧ — گەردوژمن پێشەوەی سوپاکەی بەهێز کرد پاشەڵی بێهێز دەبێت ، گەر پاشەڵی بەهێز کرد پێشەوەی بێهێز دەبێت ، لای چەپی بەهێز بکات لای ڕاستی بێهێز دەبێت ، لای ڕاستی بەهێز بکات لای چەپی بێهێز دەبێت، ئەگەر کۆمەکی نارد بۆ هەموو لایەک ، هەموو لاکانی لاواز دەبن.

١٨ — ژمارە کەمی لە ئامادەکاری ژمارە زۆری شوێنەکانەوە دێت بۆ بەرپەرچ دانەوەی هێرشەکان ، هێزی بە ژمارە زۆریش لە ناچارکردنی دوژمنەوە دێت هەمان ئامادەکاری بکات .

١٩ — زانینی شوێن و کاتی شەڕی ئایندە وامان لێدەکات هێزەکانمان چڕ بکەینەوە بە هێنانی هێزی تر لە شوێنی دوورەوە.

٢٠ — کە کات و شوێن دیاری کراو نەبوون ، لای چەپ توانای یارمەتی لای ڕاستی نابێت ، لای ڕاستیش کۆڵەوار دەبێت لە فریاکەوتنی لای چەپ ، پێشەوە ناتوانێ باری پاشەوە سوک بکات ، هەروەها پاشەوەش لە توانایدا نابێت پشتگیری پێشەوە بکات ، تەنانەت ئەگەر ماوەی نێوانیان چەند سەد مەترێکیش بێت .

**٢١ - ئەگەر سوپای دوژمن بە ژمارە لە ئێمە زیاتریش بن بەسەر ئێمەدا زاڵ نابن ، ئەتوانم بڵێم لە کاتی خۆیدا سەرکەوتن بەدەست دێت.**

**٢٢ — سەرەڕای باڵادەستی هێزی دوژمن لە ڕووی ژمارەوە، ئەتوانین ڕێگری جەنگی لێ بکەین ، پیلان دابڕێژە بۆ ئاشکراکردنی نەخشەکانی دوژمن شیانی سەرکەوتنی.**

**٢٣ — دوژمن بێزاربکە و ڕۆژی لێ تاڵ بکە سەرنجی چالاکی تواناکانی بدە، ناچاری بکە خۆی دەرخات ، بۆ ئاشکرا بوونی خاڵە لاوازەکانی ، کە بێزارت کرد لە کاردانەوەکەیدا بۆت دەرەکەوێ تەمای چیە.**

**٢٤ — بە جوانی بەراوردی سوپای دوژمن بە سوپای خۆت بکە ، بۆ ئەوەی خاڵە بەهێزو لاوازەکانیت بۆ دەربکەوێت .**

**٢٥ — کاتی مانۆرو جوڵانەوە تاکتیکیەکان ، باشترین شتێک بیکەی بە تەواوی لەبەرچاو ون بوونە و هەرچی دەتەوێ بیکەی شاراوە بێت .**

**٢٦ — چۆنیەتی و توانای بەدەست هێنانی سەرکەوتن پشت بەستنت بە ڕەفتارو تاکتیک و جوڵانەوەی دوژمن ، ئەوەش تەنها فەرماندە تێی دەگات.**

**٢٧ — هەموو ئەتوانن ئەو تاکتیکانە ببینن کە دوژمنی پێ تێک دەشکێنم ، بەڵام کەسێک ناتوانێ ئەو ستراتیژانەی سەرکەوتنی پێ بەدەست دێت ببینێ.**

**٢٨ — تاکتیک دووبارە مەکەوە ئەوەی سەرکەوتنی پێ بەدەست هاتووە ، بەڵام ئەو ڕێگایانەی پەیڕەوی دەکەی بە پێی دۆخە گۆڕاوەکان بێت .**

**٣٠ — کەواتە لە جەنگدا ، ڕێگای دروست ئەوەیە خۆت لە خاڵە بەهێزەکان بپارێزەو لەوانە بدە کە لاوازە.**

**٣١ — ئاو ڕێچکەی خۆی بە پێی سروشتی زەوی دەگرێ ، سەربازیش هۆیەکانی سەرکەوتن بەپێی دوژمنەکەی دیاری دەکات.**

٣٢ – كەواتە ئاو شێوەی نەگۆڕ وەرناگرێ ، بەهەمان شێوە جەنگیش مەرج و دۆخی تایبەتی نیە.

٣٣ – ئەوەی بتوانێ تاکتیکەکانی بە پێی دوژمنەکەی بگۆڕێ سەرکەوتنی پێ بەدەست بهێنێ ، ئەو فەرماندەیە دیاری ئاسمانە.

٣٤ – پێنج توخمەکە ( ئاو ، ئاگر ، دار ، کانزا ، زەوی ) هەموویان وەک یەک نین هەر وەک چوار وەرزەکە بوار بەیەک دەدەن کە دوای یەک دێن هەروەها وەک ڕۆژە درێژو کورتەکان و وەک هەڵاتن و ئاوابوونی مانگ .

# ٨ – مانۆڕکردن

١ – لە کاتی جەنگدا فەرماندەی گشتی فەرمانەکان لە فەرمانڕەوا وەردەگرێ.

٢ – دوای کۆکردنەوەو چڕکردنەوەی سوپاکەی ، پێویستی بە تێکەڵ کردن و رێکخستنی پێداویستەکانە پێش دامەزراندنی سەربازگە.

٣ – دوای ئەوە ، نۆری مانۆری تاکتیکی دێت ، سەختیەکانی مانۆڕ گۆڕینی چەوتیەکانە بۆ ڕاستی و خراپیەکان بۆ چاکی .

٤ – کەواتە ، گرتنە بەری ڕێگای ناڕاستەوخۆ بۆ ئەوەی دوژمن لەسەر ڕێگاکەی خۆی لابدەی و پێش ئەو بگەیتە ئامانجەکە ، نیشانەی زانیاری چەواشەکاری و فێڵی بەلارێدا بردنە.

٥ – مانۆڕی سوپا سوودی زۆرە ، بەڵام بەبێ دیسپلینی زۆر مەترسی دارە.

٦ – گەر سوپاکەت ئامادە کرد بۆ قۆستنەوەی هەلێک ئەشێ درەنگ کەوتبێتی ، لە لایەکی تریشەوە هێزێکی کەم دەکەیتە قوربانی سامان و دەبۆکانیان.

٧ – ئەگەر فەرمان بدەیت چاکەتە چەرمیەکانیان لول بدەن ، ڕۆیشتنی شەوو ڕۆژی بێ پشویان پێ بکەیت ، لە وێزە بەدەر ڕێگایان پێ ببڕیت سەد لی یان پێ ببڕیت بۆ ئەوەی بگەیتە مەبەست ، سێ بەشی ڕابەران دەکەونە دەستی دوژمن.

٨ – پیاوە بە هێزەکان لەپێشەوە دەبن ، شەکەت و ماندووەکانیش لە دواوە ، لەو نەخشەیەدا یەک لەسەر دەی سوپاکەت دەگاتە شوێنی مەبەست .

٩ – گەر پێشڕەوی ٥٠ لی بکەیت بۆ پێشدانەوەی دوژمن ، پێشڕەوی خۆت و نیوەکەت لەدەست دەدەن تەنها نیوەکەی ترتان دەگەنە ئامانج .

١٠ – ئەگەر پێشڕەوی ٣٠ لی بکەیت بە هەمان مەبەست ، دوو لەسەر سێی هێزەکەت دەگات.

١١ – ئەشێ دەستی بەسەردا بگرین پاشان ئەو سوپایە بەبێ کاروانی سامانەکانی وون دەبێت ، بەبێ ئازووقە وون دەبێت ، بەبێ سەرچاوەی پێداویستیەکانی وون دەبێت .

١٢ – ئێمە ناتوانین هاوپەیمانی ببەستین تا لە هاوسێکانمان تێنەگەین .

١٣ – ئێمە بۆ ڕابەرێتی سوپایەک ناشێین پێشڕەوی بکات لانی کەم شارەزای وڵات نەبین ، شاخەکانی دارستانەکانی ، تەلان و هەڵدێرو زەلکاوو زۆنگاوەکانی.

١٤ – ئێمە ناتوانین سروشت بە سوودی خۆمان وەرگێڕین ئەگەر شارەزایانی ناوچەکە بەکار نەهێنین.

١٥ – لە جەنگدا فێڵ بەکار بهێنە سەرکەوتو دەبیت.

١٦ – چڕ کردنەوە یا بەش بەش کردنی سوپاکە هەرچیەکیان بکەیت پێویستە دۆخەکە بڕیاری لێ بدات.

١٧ – خێراییەکەت وەک با بێ ، سەختییەکەت وەک دارستان بێت .

**١٨ – له پەلامارو دەسکەوتدا وەک ئاگر بە ، وەک شاخ ڕاوەستاوبە.**

**١٩ – با نەخشەکانت تاریک بن وەک شەوەزەنگ ، جوڵانت وەک بروسک بێت.**

**٢٠ – کاتێ گوندێک تاڵان دەکەیت ، با تاڵانیەکە لە ناو پیاوەکانتا دابەش بکرێن ، بەڵام کە شوێنێکی تر دەخەیتە ژێر دەسەڵاتی خۆتەوە دەستکەوتەکانی بۆ سەربازەکانت بێت.**

**٢١ – ڕامێنەو بیربکەوە پێش جوڵانت.**

**٢٢ – ئەو کەسە سەرکەوتوە کە فێری فرتوو فێڵ بووە ، وەک هونەری مانۆڕ.**

**٢٣ – پەرتووکی بەڕێوەبەرایەتی سوپا دەڵێت؛ دەربارەی گۆڕەپانی جەنگ وتەکانی زۆر دوور ناڕوانێت؛ هەروەها دامەزراوەی زەنگەکان و تەپڵەکان، ناشتوانێ بە ڕوونی بڕوانێتە شتە ئاساییەکان؛ هەروەها دامەزراوەی دروشمەکان و ئاڵاکانیش .**

**٢٤ – زەنگ و تەپڵ و دروشم و ئاڵا هۆکانن بۆ سەرنج ڕاکێشانی حەشاماتێک بۆ خاڵێکی دیاری کراو.**

**٢٥ – سوپا یەکەیەکی یەکگرتووە ، نەشیاوە قارەمانێک بە تەنها پێشڕەوی بکات ، یا ترسنۆکێک بە تەنها پاشەکشە بکات ، ئەوە هونەری هەڵس و کەوتە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان .**

**٢٦ – لەشەڕی شەودا ئاگرکردنەوەو تەپڵ لێدان ، لە شەڕی ڕۆژیشدا بەرزکردنەوەی درووشم و ئاڵا وەک وریا کردنەوەی گوێ و چاوی سەربازانی سوپاکەت .**

**٢٧ – شیاوە سوپایەکی تەواو گیانی لێ سەندرابێت ، فەرماندەیەکی باڵاش هۆشی لێ دزرابێت.**

٢٨ – سەرباز بەیانیان گیان لەسەر دەستەو بە پەرۆشە ، لە دوای نیوەڕۆیان لە لای ئاڵاکەیەتی ، ئێوارەش بیری لای گەڕانەوەیە بۆ سەربازگەکەی.

٢٩ – فەرماندەی ژیر ، پەلاماری سوپایەک نادات کە ورە بەرزوو بە پەرۆشە ، بەڵکو پەلاماری سوپایەک دەدات کە ڕوو لە گەڕانەوەیە ، ئەوەیە هونەری لێکۆڵینەوە لە هەواو هەوەس یا ئارەزوەکان .

٣٠ – ئارامی و هێمنی لە چاوەڕوانی دەرکەوتنی شێوان و شڵەژانی دوژمن: ئەوەش هونەری دان بەخۆدا گرتنە .

٣١ – نزیکی ئامانجەکەتیت کاتێ کە دوژمن دوورە بە حەساوەییەوە لە چاوەڕوانی دوژمندا کە پەلەیەتی و تاودەدا ، تۆ تێر و لە کاتێکدا دوژمن برسی ÷ ئەوە هونەری مێرخاسی و ئامادەکاریە.

٣٢ – خۆ دوور گرتن لە دوژمنێک لەوپەڕی ئاگاییدایە ، هەروەها پەلامار نەدانی دوژمنێک لە هێمنی و باوەڕ بەخۆبووندایە: ئەوەیە هونەری تێگەیشتن لە دۆخەکان .

٣٣ – بەڵگە نەویستە کە نابێ پەلاماری دوژمن بدەیت بۆ سەربەرەو ژووری ، هەروەها لەبەرەو خواریش کە لە بەرزیەوە دێت .

٣٤ – بە دووی دوژمنێک مەکەوە وا نیشان دەدات هەڵدێت ، پەلاماری سەربازانێک مەدە بە پەرۆشن.

٣٥ – چەشەیەک مەخۆ دوژمن فرێی دابێت ، خۆت هەڵمەقورتێنە لەو سوپایەی دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی.

٣٦ – کە گەمارۆی دوژمن دەدەیت ، کەلەبەرێکیان بۆ بهێڵەرەوە، پاڵەپەستۆ مەخە سەر دوژمنێکی بێ هیوا.

# ٩ — گۆڕینی تاکتیکەکان

١ — لە جەنگدا فەرماندەی گشتی هێزەکان فەرمان لە فەرمانڕەواوە وەردەگرێ، سوپاکەی کۆدەکاتەوە ، هێزەکانی چڕدەکاتەوە.

٢- لەناوچەیەکی سەختدا سەربازگە دامەنێ ، لە ناوچەیەک ڕێگا سەرەکیەکانی تێدایە و چوار ڕێیانی هەیە ، هاوپەیمانی دروست بکە. لە شوێنی دابڕاوو مەترسیداردا مەمێنەوە. لە پەراوێزی دۆخەکاندا پەنابەریتە بەرفێڵ ، لە دۆخی بێ هیواییدا ، دەبێت شەڕبکەیت.

٣ — هەندێ ڕێگا هەن نابێ پیا بڕۆن ، هەندێک سوپا پەلامار نەدرێن ، هەندێ شارهێرشیان نەکرێتەسەر ، هەندێ فەرمانی فەرمانڕەواش جێ بە جێ نەکرێن لە هەندێک دۆخدا.

٤ — ئەو فەرماندەیەی بە تەواوی تێدەگات لە گۆڕانکاریە تەکتیکیەکان ئەزانێ چۆن سەرۆکاری هێزەکەی بکات.

٥ — ئەو فەرماندەیەی لەو شتانە تێناگات ، لەوانەیە بەباشی لە پێکهاتەی ناوچەکە تێبگات ، بەڵام ناتوانێ زانیاریەکانی بخاتە کارەوە.

٦ — بەو پێیە خوێندکاری جەنگ کە قاڵ نەبۆتەوە لە هونەری جەنگ و نەخشەکان ، سەرەڕای شارەزاییشی لە پێنج نیشانەکە، شکست دەهێنێت لە بەکارهێنانی باشترین جەنگاوەرەکانیشی.

٧ — کەواتە لە نەخشەکانی ڕابەرێکی دانادا ، ئەڕوانرێتە سوود و زیانەکان بە تێکەڵ کردنیان.

٨ — لە چاوەڕوانیمان بۆ سوود وەرگرتن ئەم ڕێگایە بگرەبەر ، لەوەیە سەرکەوتو بین لەبەشە بنچینەیی نەخشەکانمان .

٩ — ئەگەر لە لایەکی ترەوە، لە ناخی سەختیەکاندا هەمیشە ئامادە بین قازانج بکەین ، لەوەیە لە بێ بەختی دەرباز بووبێتین.

١٠ – بۆ کەم کرنەوەی ژمارەی دوژمن ، تێکیان بشکێنەو گرفتی زۆریان بۆ درووست بکە ، سەرقاڵیان بکە بە گرفتە ناوخۆییەکانیان ، چەشەیان بۆ دانێ و وایان لێ بکە خێرا بۆی بچن.

١١ – هونەری جەنگی فێرمان دەکات پشت نەبەستین بەو گریمانەیەی دەڵێ دوژمن هێرش ناهێنێ ، بەڵکو خۆ ئامادەکردنی تەواومان بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی، نەک دوو دڵ بین لە کردن و نەکردنی ، بەڵکو هەڵوێستی سەربازی ئێمە توندو تۆڵە گومانی تێدا نیە.

١٢ – پێنج هەڵەی ترسناک هەیە لەوەیە فەرماندە تێی بکەوێ:

١) بێباکی ، کە ماڵ وێرانی لە دوایە.

٢) ترسنۆکی ، دەبێتە هۆی بە دیل گیران .

٣) هەڵەشەیی ، بە هۆی ڕیسواییەوە دەورووژێت .

٤) هەستیاری زیاد بۆ ئابڕو ، مایەی شەمەزاریە .

٥) پەرێشان بوون بۆ پیاوەکانی وای لێ بکات بێ ئارام بێت.

١٣ – ئەو پێنج هەڵەیە فەرماندە بێزار دەکات ، کە کاری گەری کوشندەی هەیە لەسەر بەڕێوە بردنی جەنگ.

١٤ – کە سوپایەک شکست دەخوات و فەرماندەکەی دەکوژرێت، هۆیەکە هەر چیەک بێت لەو پێنج هەڵەیە بە دوور نیە، ئەو هەڵانە بخەرە تێڕامان و تەگبیرەوە.

# ١٠ – دۆخەکانی زەوی

١ – ئەتوانین زەوی پۆلین بکەین بۆ شەش دۆخ :

١)  زەویە ئاسانەکان

٢) زەویە ئاڵۆزەکان

٣) زەویە ئاستەنگدارەکان

٤) زەوی دەربەندەکان

٥) بەرزاییە ترسناکەکان

٦) ئەو شوێنانەی زۆر دوورن لە دوژمنەوە

٢ – ئەو زەویانەی ئازادانە بە هەردوو لادا پیا تێ دەپەڕیت ، پێیان دەوترێت ئاسان بەدەست هاتوو .

٣ – ئەو زەویانەی سروشتیان وابێت ، پێویستە پێش دوژمن دەستی بەسەردا بگیرێت ، بە تایبەت شوێنە بەرزو بەرخۆرەکان ، ئاگاشت لە هێڵی کۆمەکت بێت ، ئەوکاتە ئەتوانی باشترین شەڕ بکەیت بە قازانجی خۆت .

٤- ئەو زەویانەی بەجێیان دەهێڵی بەڵام گرتنەوەیان سەختە پێیان دەوترێ مەترسی دارەکان .

٥ – لەو دۆخەدا کە دوژمن ئامادە نیە ، ئەتوانی هێرشی کوتووپڕی بۆ بکەیت و بیشکێنی ، بەڵام ئەگەر دوژمن ئامادە بوو بێتە سەرت و نەتوانی بیشکێنی گەڕانەوە ئەستەمە ، کارەساتت بەسەردا دێت.

٦ – ئەو زەوییەی ئەستەمە هەردوولا بیگرن لە هەنگاوەکانی یەکەمدا ، ئەوە پێی دەڵێن ئاستەنگدارەکان.

٧ – لە دۆخێکی وادا ، تەنانەت دوژمن چەشەشی بۆ داناوین ، چاکتر وایە هێزەکانمان پارچە پارچە نەکەین ، بەڵکو پاشەکشە بکەین بە شێوەیەک دوژمن  پێمان فریو بخوات و هەر کە بەشێک لە سوپاکەی جوڵاند بۆ لێدانمان لەوەیە بتوانین هێرش بکەینە سەری بەقازانجمان بێت .

٨ – دەربارەی دەربەندەکان ، گەر توانیت زووتر داگیری بکەیت ، هەوڵ بدە قایمی بکە بە باشی و چاوەڕوانی هاتنی دوژمن بە.

٩ – سەرەڕای توانای دوژمن بۆ پوچەڵ کردنەوەی نەخشەی گرتنی دەربەندێک ، مەچۆرە پشتیەوە ئەگەر دەربەندەکەی قایم کردووە ، ئەگەر لاواز بوو لە قایم کردنیدا بچۆرە پشتیەوە .

١٠ – دەربارەی بەرزاییە ترسناکەکان گەر پێش دوژمن کەوتی خاڵە هەرە بەرزوو بەرخۆرەکان داگیر بکەو چاوەڕێ بکە سەربکەوێ.

١١ – ئەگەر پێش تۆ گرتی بەدووی مەکەوە و بگەڕێوە وای لێ بکە دابەزێتە خوارەوە.

١٢ – ئەگەر شوێنەکەت ماوەی زۆر دوورە لە دوژمنەوە ، هەردوو هێزەکەش یەکسانن ، ورووژاندنی شەڕ ئاسان نیە لە نێوانتانا ، بەڵکو شەڕ لە قازانجیشمان بێت .

١٣ – ئەمەش شەش بنەمای پەیوەست بە زەویەوە . هەر فەرماندەیەکی سەربازی کە گەیشتۆتە ئەو بەرپرسیارێتە پێویستە ئەو بنەمایانە باش بخوێنێت .

١٤ – سوپاکان ڕووبەڕووی شەش جۆری مەترسی دەبنەوە کە هیچیان ناگەڕێنەوە بۆ هۆی سروشتی بەڵکو لە هەڵەی فەرماندەوەیە ، بەر پرسیارێتیەکەی فەرماندەی سەربازی هەڵی دەگرێت ئەمانەن :

١) تاودان / ڕوخان / هەڵاتن .

٢) یاخی بوون .

٣) ورەبەردان .

٤) وێران بوون .

٥) تێکچونی شیرازە .

٦) تێکشکان .

١٥ – ئەگەر دۆخەکان یەکسان بوون و هێزێکی سەربازی خرایە شەڕەوە لەگەڵ هێزێکی سەربازی دەیان کەڕەت لەو بەهێز تر بوو ، ئەنجامەکەی بریتیە لە تاودانی هێزی یەکەم .

١٦ – گەر سەربازە ئاساییەکان زۆر بەهێز بوون بەڵام ئەفسەرەکانیان لاواز بوون ئەنجامەکەی یاخی بوون و بێ فەرمانی دروست دەبێت لە لایەن سەربازانەوە ، بە پێچەوانەشەوە گەر ئەفسەرەکان زۆر بەهێز بوون سەربازەکان لاواز بوون ڕوخان و ورەبەردان و لاوازی گشتی ئەنجامی دەبێت .

١٧ – کاتێ ئەفسەرە بەرزەکان تووڕەدەبن و یاخی دەبن لە جێ بە جێ کردنی فەرمانەکان ، دەبینی لە شەڕی دژی دوژمندا بە ئارەزوی خۆیان بە هۆی هەست بە بێزاری کردن شەڕ هەڵدەگیرسێنن پێش ئەوەی فەرماندەی گشتی فەرمانی شەڕی دەرکردبێ ، ئەنجامیش ماڵ وێرانی و تەفرو تونا بوونە .

١٨ – کاتێ فەرماندەی گشتی لاوازەو بێ دەسەڵات کراوە ، کە فەرمانەکانی نا ڕوونە ، کاتێ ئەرکە ئاسایی و دیاری کراوەکان بۆ ئەفسەران سەربازان لە ئارادا نەبن ، کە پلە سەربازیەکان بە گەندەڵی و هەڕەمەیی ڕێک دەخرێن ، ئەنجامەکەی دۆخێک لە بێ سەرەوبەرەیی پێکهاتەی سەربازی دەرەکەوێ.

١٩ – کاتێ فەرماندە دەستەوسانە لە خەمڵاندنی هێزی دوژمن ، هێزێکی بچووک دەتوانێ شەڕی هێزێکی گەورە بکات ، یا دەتوانرێ دەستەیەکی لاواز بنێردرێتە وێزەی هێزێکی لەخۆی بە هێز تر ، ڕەچاو نەکردنی دۆخی خراپی سەربازەکانی بەرەی پێشەوە ، دەبێتە هۆی تێکشکان .

٢٠ – ئەوە ئەو شەش دۆخەیە لە تێکشکانەکان لە گۆڕەپانی جەنگدا. کە دەبێ زۆر بە وردی بخوێندرێ لە لایەن ئەو فەرماندەیەی دادەمەزرێت لەو

بەر پرسیارێتیەدا .

٢١ — ڕێکخستنی دروستی دەوڵەت باشترین هاوپەیمانی سەربازە ، بەڵام توانای هەڵسەنگاندنی هێزی دوژمن ، ڕاپەرمون بەسەر هۆیەکانی سەرکەوتن و ورد بوونەوە لە سەختی وماندوبوون و باش هەڵسەنگاندنی کۆسپ و تەگەرەکان و مەترسی و ماوەکان ، ئەوانە گشتی فەرماندەی مەزن دەخاتە ژێر تاقی کردنەوەوە .

٢٢ — ئەو کەسەی بە باشی ئەو خاڵانە بزانێت ، بیخاتە بواری جێ بە جێ کردنەوە لە جەنگدا لە شەڕەکانیدا سەردەکەوێت ، بێگومان ئەوەی نایزانێ شکست دەهێنێت .

٢٣ — کە ئەنجامی شەڕ سەرکەوتن بێت ، کەواتە دەبێ شەڕ بکەیت ، تەنانەت گەر فەرمانڕەوای گشتیش ڕێگرت بوو،گەر شەڕکردن سەرکەوتن بەدەست نەهێنێ نابێ بیکەیت گەر فەرمانڕەوای گشتی فەرمانیشی پێکردی .

٢٤ — ئەو فەرماندە سەربازیەی کە پێشڕەوی دەکات هیچ بیر لە ناوبانگی خۆی ناکاتەوە ، ناترسێ لە پاشەکشە کردن کە ناوی دەزڕێت لەسەر ئەو باوەڕەی کە دەبێ خزمەتی وڵات و شا بکات ، ئەو فەرماندەیە دوڕی تاجی دەوڵەتە .

٢٥ — بنواڕە سەربازەکانت وەک ئەوەی منالّی خۆت بن ، بەدوات دەکەون بۆ هەرە ناخۆشترین شوێنەکان ، بنواڕە لێیان وەک خۆشەویست ترین کوڕەکانت ، لەگەڵتا خۆیان بە کوشت دەدەن .

٢٦ — تۆ چەند باش بیت ، بەڵام نەتوانی وا بکەیت سەربازەکانت سنوری دەسەڵاتت بزانن ، چەند دڵت باش بێت بەڵام نەتوانی فەرمانەکانت بسەپێنی ، لەسەر ئەوەشەوە نەتوانی ئاژاوەو پشێوی دابمرکێنیتەوە ، سەربازەکانت وەک منالّی نازداریان لێ دێت هەرچی سوودو قازانجە نایان بێت .

٢٧ — گەر زانیمان سەربازەکانمان توانای هێرشیان هەیە، بەڵام نەمانزانی

دوژمن ڕێ بەهێرش نادات ، ئەو کاتە ئێمە نیوەی ڕێی سەرکەوتنمان بڕیوە .

٢٨ — گەر زانیمان دوژمن لە دۆخێکدایە هێرشی بۆ بکرێت ، بەڵام سەربازەکانی خۆمان لەو دۆخەدا نەبوون ، ئێمە نیوەی سەرکەوتنمان بڕیوە .

٢٩ — گەر زانیمان دوژمن لە دۆخێکدایە دەتوانرێ هێرشی بۆ بکرێت ، سەربازانی خۆشمان لە دۆخی هێرش بردندان ، بەڵام نەمانزانی سروشتی گۆڕەپانی جەنگ بێ کەڵکە ، هێشتا ئێمە لە نیوەی ڕێگای سەرکەوتنین .

٣٠ — بەو پێیە سەربازی ئامادەو شارەزا ، کە دەکەوێتە جوڵان تووشی دڵە ڕاوکێ و شڵەژان نابێت ، کە سەربازگە دادەنێت هیچ زیانێک ناکات .

٣١ — کەواتە ڕاستە کە دەڵێین : گەر دوژمنت ناسی و خۆشت ناسی ، بێگومان سەرکەوتن هی خۆتە ، گەر کەش و زەوی جەنگت ناسی ، سەرکەوتنەکانت بە دەست دەهێنی .

# ١١ — نۆ ڕەوشەکە

١ — هونەری جەنگ باس لە ٩ ڕەوشی زەوی دەکات :

١) زەوی پەرت.

٢) زەوی ئاسان.

٣) زەوی شەڕ.

٤) زەوی کراوە .

٥) زەوی چوار ڕێیانیەکان و خێراکان.

٦) زەویە مەترسیدارەکان.

٧) زەویە سەختەکان.

٨) زەویە گەمارۆدراوەکان.

**٩) زەویە بێ هیواکان.**

**٢- کاتێ فەرماندە لەسەر زەوی خۆی شەڕدەکات ، لەسەر زەوی پەرتە .**

**٣ — کە فەرماندە دەچێتە زەوی دوژمنەکەیەوە بۆ ماوەیەکی کورت ، لە زەوی ئاساندایە.**

**٤ — ئەو زەویەی دەهێنێ دەستی بەسەردا بگیرێت ، سوودی بۆ هەر دوولا هەیە زەوی شەڕە.**

**٥ — ئەو زەویەی کە هەردوولا بە ئازادی تیایدا بجولێنەوە ، زەوی کراوەیە.**

**٦ — ئەو زەویەی کلیلی بەیەکگەیشتنی سێ وڵاتی هاوسێیە ، ئەو زەویەی ژمارەیەکی زۆری ڕێگاو چوار ڕێیانی تێدایە ، زەوی ڕێگاکانە.**

**٧ — کە سوپایەک دەچێتە قوڵایی زەوی دوژمنەوە و ژمارەیەکی زۆر شار دەخاتە پشتەوەی خۆی بەبێ ئەوەی گرتبێتی ، ئەوەش زەویە مەترسیەکانە.**

**٨ — دارستانەکان چاڵ و چۆڵ و زۆنگاوی قوڵ و لیتاوی ، هەموو ئەو زەویانە تێپەڕین تیایاندا ئاسان نیە ، ئەوەش زەویە سەختەکانە.**

**٩ — ئەو زەویانەی گەیشتن پێیان لە ڕێی دەربەندەکانەوە بێت، پاشەکشەش هەر لەدەربەندەکانەوە بێت ، پارێزراو نین کە دەستەیەکی بچوک دەتوانێ ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکان لە ناو بەرێ ، ئەو زەویە گەمارۆ دراوەکانە ،**

**١٠ — ئەو زەویەی تەنها بەشەڕ لە تیاچوون ڕزگارمان دەبێت لێی ، زەویە بێ هیواکانە.**

**١١ — بۆیە لەسەر زەوی پەرت شەڕ مەکە لە زەوی ئاسان مەوەستە ، هێرش مەکە سەر ئەو زەویانەی ناهێنێ لە سەریان شەڕ بکەی .**

**١٢ — لە زەوی کراوەدا ڕێگری لە دوژمن مەکە ، لە چوار ڕێیانەکاندا هاوپەیمانی درووست بکە لەگەڵ جیرانەکاندا.**

**١٣ — له زەویە مەترسیدارەکان ، تالآن و بڕۆی خۆت بکە . له زەویە سەختەکان درێژە بە پێشڕەویەکەت بدە.**

**١٤ — له زەویە گەمارۆدراوەکان پەنا بەرەوە بەر فێڵ و لەسەر زەویە بێ هیواکان شەڕ.**

**١٥ — سەرکردە دێرینەکان ئەوانەی قاڵەوەبوون درکیان بەوە کرد چۆن پوازێک بدەن لەناوەقەدی دوژمن پاش و پێشی لێک جیا بکەنەوە ، هەموو جۆرە پەیوەندی و هاوکاریەکیان له نێوانیان بڕی تا یەکە گەورەکانیان دەستیان نەگاتە یەکە بچوکەکان ، تا نەتوانن یەکە بچوکەکان ڕزگار بکرێن ، هەروەها فەرماندەکانی دوژمن نەتوانن سەربازە پەراگەندەکان بهێننەوە بۆ شەڕ.**

**١٦ — کاتێ سەربازانی دوژمن یەکگرتون ، فەرماندە دێرینەکان دەتوانن نێوانیان تێک بدەن و پەرتیان بکەن.**

**١٧ — گەر بە قازانجیان گەڕایەوە، فەرمان دەدەن پێشڕەوی بکەن، بە پێچەوانەوە وەستان بۆ دروست کردنی ئاژاوە لە نێو دوژمندا.**

**١٨ — گەر دەپرسی چی بکەین بەرامبەر دوژمنێکی ژمارە زۆر ، زۆر زل ، ڕێک و پێک ئامادەی پێشڕەویە بەرامبەرم؟ دەڵێم : هەوڵ بدە بە دەستگیرکردنی شتێکی زۆر بە نرخی دوژمن دوایی مل بە هەموو داواکانت دەدا.**

**١٩ — خێرایی گەوهەری جەنگە ، سووربە لەسەر تەییار نەبوونی دوژمن ، هێرش بەرەو ئەو هۆیانە بەکار بهێنە کە بە بیری دوژمندا نایات و پەلاماری خاڵە بێ پاسەوانەکان بدە.**

**٢٠ — ئەمەش ئەو بنەمایانەیە کە دەبێ ڕەچاو بکرێت لە لایەن هێزەکانی هێرش بەر ، چەند هێزەکانت لە قوڵایی دوژمن دابن ئەوەندە هاریکاریان باشتر دەبێت، بەو جۆرە بەرگریکاران نا توانن هیچت لێ بەدەست بهێنن.**

**٢١ – پەلاماری وڵاتە بە پیتەکان بدە لە پێناو خۆراکی سوپاکەت.**

**٢٢ – بە گرنگیەوە لە هۆکانی خۆشگوزەرانی سەربازانت بکۆڵەرەوە ، باجی زیاتر مەخەرە سەریان ، توانای خۆت چڕ بکەرەوەو هێزەکانت بپارێزە ، سوپاکەت بە یەکەوەبن هەمیشە لە جوڵەدا بن نەخشەی وا دابڕێژە لای دوژمن نەزانراوو تێگەیشتنی ئاسان نەبێت.**

**٢٣ – سەربازەکان بخەرە شوێنی وا مردن بخوازن نەک هەڵاتن. گەر سەربازەکانت ڕووبەڕووی مردن بونەوە ئەوەی نەکراوە دەیکەن . ئەو کاتە سەربازەکان و ئەفسەرەکان بە یەکەوە هەموو توانای خۆیان دەخەنە کار.**

**٢٤ – سەربازەکان هەست کردنیان بە بێ هیوایی و ترس لە دەست دەدەن، کە دەرەتانێکیان نەبێت بۆ هەڵاتن خۆگرین ، ئەگەر لەسەر زەوی دوژمن بوون ئەوانەی پێشەوەیان سەرسەخت دەبن ، گەر هیچ هاوکاریەک فریایان نەکەوێت، بەوپەڕی سەختی و خۆگریەوە شەڕ دەکەن.**

**٢٥ – بەو جۆرە بێ فەرمان دەرکردن ، سەربازەکان بەخششیان دەبێ بەبێ پرسیار ، ئەوەی دەتەوێ جێ بە جێی دەکەن پێش داواکردن لێیان ، بێ دوودڵی ،لەو پەڕی بەخشیندان ، کە دەتوانی پشتیان پێ ببەستی .**

**٢٦ – بیرکردنەوەی شوم بوەستێنە ، ئەفسانەو گومان مەهێڵە ، تا ئەو کاتەی مردن دێتیش ، نابێ لە کارەساتیش بترسی.**

**٢٧ – گەر سەربازەکانت چیتر گرنگی بە پارە نادەن ، ئەوە ناگەیەنێ ئارەزویان لە پارەداری نەماوە ، گەر ژیانیان ئەوەندەی بەبەرەوە نەماوە ، ئەوە ناگەیەنێ ئارەزوی ژیانیان نەماوە.**

**٢٨ – ئەو ڕۆژەی فەرمان دەردەکەیت بۆ شەڕ سەربازەکان فرمێسک دەبارێنن بە خوڕ تا ڕادەی تەڕکردنی کراسەکانیان ، ئەوە لە ترسان نیە ، بەڵکو لە پەیمانەکەیانەوەیە کە بەڵێنی جێ بە جێ کردنی فەرمانەکان یا**

**مردن ، بیان بینە لە شەڕدا بزانە چۆن ئازایەتی *شو* یان *کیو* (دوو کەسایەتی وڵاتی چین بوون ) دەنوێنن.**

**٢٩ – ئەتوانی تاکتیکە کارامەیەکان بچوێنیت بە مارەکەی *شویی – جان* کە لە شاخەکانی *شانج* دا هەن ، ئەو مارە کە لە سەری دەدەی بە کلکی پەلامارت دەدات کە لە کلکی دەدەی بە سەری پەلامارت دەدات ، کە لە ناوقەدی دەدەیت بەسەری و کلکی پەلامارت دەدەن.**

**٣٠ – پرسیار بکە گەر سوپایەک هەبووبێ لاسایی *شویی – جان* یان کردبێتەوە، لە وەڵامدا دەڵێم بەڵێ : پیاوانی *وو* لەگەڵ پیاوانی *یو* دوژمنی سەرسەختی یەکتری بوون ، کە زێ یەکیان بڕی بە یەک بەڵەم زریانێکیان لێ پەیدا بوو وا یارمەتی یەکیان کرد دەتگوت دەستی ڕاستە یارمەتی دەستی چەپ دەدات.**

**٣١ – بەستنەوەی ئەسپەکان بەس نیە تا ڕانەکەن ، چەقاندنی پێچکەی ئارەبانەکان لە لمدا بەس نیە تا سەربازەکان ڕانەکەن.**

**٣٢ – ئەو بنەمایەی کە بۆتە بنچینەی بەڕێوەبردنی ڕێکخستنی کاروباری سوپا لە دانانی پێوانەی ئازایەتیەوە هاتوە کە دەبێ لە هەمواندا پەیدا بێت.**

**٣٣ – چۆن دەتوانین ئەوپەڕی سوود وەرگرین لە بەهێز و لاواز ؟ ئەم پرسیارە بەکارهێنانی دروستی زەوی دەگەیەنێ .**

**٣٤ – فەرماندەی کارامە کە ڕابەرایەتی سوپایەک دەکات ، وەک ئەوە وایە پیاوێک هەڵسوڕێنێ بە دەستی.**

**٣٥ – کاری فەرماندەیە کە دەبێ هێمن بێت کە بەشێکە لە نهێنی پاراستن ، ڕاستگۆو دادپەروەر بێت ، بەوە جێگیر بوونی سیستەمی گشتی دابین دەکات.**

**٣٦ – پێویستە ئەفسەرو سەربازەکانی بشڵەژێنیٚ لە ڕێی دیاردەو ڕاپۆرتی فرۆ فێڵاویەوە ، بەوجۆرە وایان لێ بکات جگە لە سوپا ئاگایان لە هیچ شتێکی تر نەبێت وەک ئەوەی هەموو شتێکی فەرامۆش کردبێت.**

**٣٧ – فەرماندەی دانا بە پیاچونەوەی ئامادەکاریەکان وگۆڕینی نەخشەکان وا بکات دوژمنەکەی دڵنیا نەبێ لە زانیاریەکانی ، بە گوێزانەوەی سەربازگەکانی و گرتنەبەری ڕێگای خوارو خێچ و ناڕاستەوخۆ وا لە دوژمن بکات نەزانێ ئامانجەکان چین .**

**٣٨ – لە ساتی براندنەوەدا ، فەرماندە ڕەفتارێکی سەیر دەنوێنێ لە کاتی چوونە سەر شوێنێکی بەرز پاڵێک بەو پەیژەیەوە دەنێ کە پێی سەرکەوتوە بێ ئەوەی دەستی دەرکەوێ پیاوەکانی ئەخاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی دوژمن .**

**٣٩ – بەلەمەکان دەسووتێنێ کاسەو مەنجەڵی خۆراکی دەشکێنێ وەک شوانێک ڕانێک پێش خۆی بدات بە ڕێگایەکدا بێ ئەوەی کەس بزانێ بۆ کوێ دەچێ.**

**٤٠ – کۆکردنەوەی سەربازان و بردنیان بەرەو مەترسی ÷ ئەوەیە ئیشی فەرماندە.**

**٤١ – پێوانە جیاوازەکانی ٩ ڕەوشەکەی زەوی ئەمانەن ، ئاستی گونجاوی تاکتیکەکانی هێرش بردن و بەرگری کردن، هەروەها یاسا بنچینەییەکانی سروشتی مرۆڤ ، ئەوانە دەبێ بە گرنگیەوە بخوێندرێن.**

**٤٢ – لە داگیرکردنی زەوی دوژمندا ، بنەمای گشتی ئەوەیە بچیتە قوڵایی دوژمنەوە تا سوپاکەت بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورت لە خاکی دوژمن بیت سوپاکە تووشی پەرت بوون و بەرەڵایی دەبێت.**

٤٣ – که وڵاتی خۆت جێ دەهێڵیت ، ئەکەویتە خاکی هاوسێکانتەوە لە وڵات دادەبڕێیت ، ئەوکات لە شوێنێکی ناسکدا دەبیت لەهەر چوارلاوە ڕێگاو چوار ڕێیان.

٤٤ – که دەچیتە قوڵایی وڵاتێکەوە ، زەویەکە دەبێتە مەترسی دار ، بەڵام که ماوەیەک دەچیتە ناوەوە ، زەویەکە ئاسانەکانە.

٤٥ – کاتێ قەڵاکانی دوژمن دەکەوێتە پشتەوەت ، دەربەندەکان لە پشتەوە، زەوی گەمارۆت دەدات ، ئەوکاتە پەناگات نامێنێ تۆ لە زەویە بێ هیواکاندای.

٤٦ – کاتێ لە زەویە پەرتەکانی ، هەناسەیەک دەدەمە بەر سەربازەکانم و هیوایان بەبەردا دەکەم بەوەی لە پێناو یەک ئامانجداین.

٤٧ – لەسەر زەوی شەڕ پەلە لە پشتەوەی سوپا دەکەم.

٤٨ – لە زەوی کراوەدا ، چاوم لەسەر بەرگریکارانمە ، لەو زەویانەی کە ڕێگای گشتی و چوار ڕێیانەکانی تێدایە تەبایی لەگەڵ هاوپەیمانەکانم دەکەم.

٤٩ – لەسەر زەوییە ترسناکەکان ،کار دەکەم لەسەر نەپچڕانی هێڵەکانی کۆمەک، لەسەر زەویە سەختەکان درێژە بە ڕۆیشتنم دەدەم بە خێرایی.

٥٠ – لە زەویە گەمارۆدراوەکاندا ، هەر ڕێگایەک شیاوی هەڵاتن بێت دایدەخەم، لەسەر زەویە پەرتەکانیش ، کە هیوایەک نیە بۆ ڕزگار بوونیان سەربازەکان ئاگادار دەکەمەوە هەرچیەکیان پێ دەکرێت بۆ ڕزگارکردنی خۆیان بیکەن .

٥١ – لەبەر ئەوەی سەرباز ئەوپەڕی بەرگری دەکات کە گەمارۆ دەدرێت ، زۆر سەر سەختانە شەڕ دەکات کاتێ کە ناتوانێ یارمەتی خۆشی بدات ، زۆر مل کەچانە فەرمانەکان جێ بەجێ دەکات کە دەکەوێتە مەترسیەوە.

٥٢ – ناتوانین بچینە ناو هاوپەیمانیەوە لەگەڵ هاوسێکانمان تا بەتەواوی نەزانین نەخشەو ئامانجەکانیان چیە ، ڕابەرایەتی سوپایەکمان پێ ناکرێت گەر شارەزای سروشتی زەویەک نەبین کە سوپاکەمانی پیادا تێپەڕ دەبێت، شاخەکانی ، دارستانەکانی ، مەترسیەکانی هەڵدێر و زۆنگاوەکانی ، ناتوانین لە بەرژەوەندی خۆماندا بیرەخسێنین گەر داوای یارمەتی لە ڕاوێژکارانی ناوچەکە نەکەین .

٥٣ – فەرامۆش کردنی هەر یەک لەم چوار یا پێنج بنەمایەی خوارەوە ناگونجێت لە گەڵ شازادەی جەنگدا.

٥٤ – کاتێ شازادەیەکی جەنگ هێرش دەکاتە سەر شازادەنشینێکی بە هێز، توانای ڕابەرایەتی کردنی لەوەدا دەرەکەوێ کە نەهێڵێ دوژمن هێزەکانی چڕبکاتەوە. ترس و تۆقین ئەخاتە دڵی نەیارانیەوە ، ڕێ دەگرێ لە هاوپەیمانە نەیارەکانی بەشداری بکەن لەو شەڕەدا دژی.

٥٥ – شازادەی جەنگ تێناکۆشێ لە پێناو هاوپەیمانی لەگەڵ هەموو جۆرە خەڵکێک ، هێزیش نادات بە شازادە نشینەکانی تر. شازادەی جەنگ نەخشەکانی خۆی جێبە جێ دەکات لەگەڵ تۆقاندنی دوژمن . ئەو جۆرە شازادەیە دەتوانێ دەست بگرێت بەسەر شاری نەیارەکانی و پاشایەتیەکانیان وێران بکات.

٥٦ – پاداشتەکان ببەخشە بەبێ گوێدانە ڕێسای دیاری کراو ، فەرمانەکان دەربکە گوێ مەدەرە پێشینەی ئامادەکاریەکان ، بەوجۆرە دەتوانی مامەڵە لەگەڵ هەموو سوپادا بکەیت وەک مامەڵەکردن لەگەڵ سەربازێک.

٥٧ – فەرمان بدە بە سەربازەکانت و مەهیڵە بە نەخشەکانت بزانن، کە ئامانجە باشەکان ڕوون دەبنەوە لە بڕیارەکانتدا ، لەبەرچاوی سەربازەکانتا ڕوونی بکەوە، بەڵام دەربارەی ئەنجامە باشەکان هیچیان پێ مەڵێ .

٥٨ – سوپاکەت بخەرە ناوەندی مەترسی مردنەوە لێی دەرباز دەبێت ،

فرێیانده ناو تەنگانەو دۆخی نەخوازراوو بێ هیواییەوە بێ زیان دەردەچن.

٥٩ — بە دیاری کراوی هەر هێزێک لە ڕووی مەترسیدا ڕاوەستێ ئەتوانێ سەرکەوتن بەدەست بهێنێ.

٦٠ — بەدەست هێنانی سەرکەوتن لە جەنگدا جێ بە جێ دەبێ بە پێی خۆ ئامادەکاریەکانمان بە وردی بۆ نیازەکانی دوژمن .

٦١ — بە کۆڵنەدان لە لێدانی باڵەکانی دوژمن ، ئێمە سەردەکەوین و ئەتوانین لە بەردەوام بووندا فەرماندەی گشتیان بکوژین.

٦٢ — ئەوەیە پێی دەڵێن توانای جێ بە جێ کردنی هەر شتێک بە کارامەیی و لێهاتوویی.

٦٣ — لەو ڕۆژەوەی ڕابەرایەتی دەکەوێتە دەستت ، هەموو ڕێڕەوەکانی بەرەی جەنگ دابخە ، خاڵەکانی ڕێگەدان و هەموو شاندوو هاتن و چوونان ڕابگرە.

٦٤ — زۆر سەخت بە لە ئەنجوومەنی ڕاوێژکاران ، تا بتوانی زاڵ بیت بەسەر دۆخەکە.

٦٥ — گەر دوژمن دەرگایەکی بە کراوەیی داخست ، خێرا خۆتی تێ خزێنە.

٦٦ — نەخشەکانی دوژمن پوچەڵ بکەرەوە بەدەست بەسەردا گرتنی هەرچی بایەخدارە لە لای دوژمن و ژیرانە نەخشەیەکی بۆ داڕێژە بۆ کاتی گەیشتنی بە گۆڕەپانی جەنگ.

٦٧ — ئەو ڕێگایە بگرەبەر کە یاسا دیاری دەکات ، دۆخەکانی خۆت بگونجێنە بە پێی دوژمن بۆ ئەوەی بچیتە شەڕێکی بڕێنەرەوانەی چارەنوس ساز.

٦٨ — لەسەرەتادا خۆت زۆر کلۆڵ نیشان بدە تا کەلەبەرێک لە ڕیزەکانی دوژمندا دەرەکەوێ ، دوای ئەوە بە خێرایی کەروێشکی شاخی هێرش بکەرە

سەری ، ئەو دەمە بۆ ئەو زۆر درەنگ دەکەویَ بەرپەرچی هێرشەکەت بداتەوە .

# ١٢ — هێرش کردن بە ئاگر

١ — پێنج ڕێگا هەیە بۆ هێرش کردن بە ئاگر :

یەکەم : سوتاندنی سەربازەکان بە چادرگاکەیانەوە ،

دووهەم : دەبۆکانیان بسووتێنە ،

سێهەم : سوتاندنی هۆکانی گواستنەوەیان ،

چوارەم : سوتاندنی کارگەی دروست کردنی چەک ،

پێنجەم : ئاگر باران کردنی ڕیزەکانی دوژمن .

٢ — بۆ ئەوەی هێرش بکەین ، پێویستە جێ و ڕێی گونجاومان هەبێت ، پێویستە پێکهاتەو ئامێرەکانی پێویست بۆ هێرش کردن هەمیشە لە دۆخی ئامادە بوونی تەواودا بێت .

٣ — وەرزێکی گونجاو هەیە بۆ هێرش کردن بە ئاگر ، هەروەها ڕۆژی تایبەتیش گونجاو بێت لەگەڵ ئەو ئاگرە گەورەیە .

٤ — وەرزی وشکانی گونجاو ترینە ، گونجاوترین ڕۆژەکانیش کە مانگ نویَ یە یا ١٤ یە یا ٢٧ و ٢٨ ی مانگ ئەم ڕۆژانە با هەڵدەکات بە باشی .

٥ — بە ئاگر هێرش کردن ، ئامادە کاری بۆ ٥ پێشهات بکریَ لەوانەیە ڕوو بدات:

٦ — ١) کاتێ ئاگرەکە لە ناوەڕاستی سەربازگەکەوە سەرەکات بۆ دەرەوە ، یەکسەر لەدەرەوە هێرش دەست پێبکە.

٧ — ٢) ئاگرەکە بڵاوبۆوە بەڵام سەربازانی دوژمن هێمنیان پاراست ،

**خۆگربوون، چاوەڕێکە تا گونجاو نەبێت هێرش مەکە.**

**٨ — ٣)کاتێ شاڵاوی ئاگر تا ئەوپەڕی بەرز دەبێتەوە ، بە دوایدا هێرش بکە گەر لە تواناداا بوو گەر نا لە شوێنی خۆت بمێنەوە.**

**٩ — ٤) گەر شیاو بوو هێرش بە ئاگرەوە بکەیت لە دەرەوەی سەربازگەوە چاوەڕێ مەکە تا سەربازگەکە لە ناوەوە هەمووی دەسووتێ ، بەڵام کاتی گونجاو هێرش هەڵبژێرە.**

**١٠ — ٥) کە ئاگر دەکەیتەوە لەو شوێنەوەی با لێوەی هەڵدەکات بیکەرەوە، بەرەو ڕووی با هێرش مەکە.**

**١١ — هەڵکردنی بای ڕۆژ کاتێکی زۆر دەخایەنێ ، بای شەوانە بە خێرایی دەکەوێت .**

**١٢ — لە هەموو سوپایەکدا ئەو ٥ گەشەسەندنانەی پەیوەستن بە ئاگرەوە بە باشی زانراو بێت ، بە هەند وەرگرتنی جوڵانی ئەستێرەکان ، هەروەها زانینی کات و ڕۆژەکان بە وردی.**

**١٣ — کەواتە ئەوانەی ئاگر بەکار دەهێنن لە هێرشەکانیاندا ژیرن ، ئەوانەیشی ئاو بەکار دەهێنن بۆ یارمەتی دانیان لە هێرش بردندا هێزێکی زیاتریان دەداتێ.**

**١٤ — لە ڕێگای ئاوەوە ئەتوانرێ ڕێگە بە دوژمن بگیرێ ، بەڵام نابێ هەرچیان هەیە بدزرێ.**

**١٥ — شادمان نابێت ئەوەی بیەوێ سەرکەوێ لە شەڕەکانیدا و هێرشەکانی بە قازانجی خۆی تەواو بێت گەر گیانی سەرکێشی لەسەربازەکانیدا پێ نەگەیاندبێ ، ئەنجام کات بە فیڕۆدان و ڕەنج بێوەریە.**

**١٦ — فەرمانڕەوای زانا پێشکات نەخشەکانی دادەنێت . فەرماندەی سەرکەوتووش ئاگای لە سەرچاوەکانی و سەربازەکانییەتی.**

١٧ – مەجوڵێ تا هەلێکت دەست دەکەوێ ، هێزت بەکار مەهێنە گەر قازانجێکی لێ نەکەیت ، شەڕ مەکە گەر دۆخەکەت خراپ نەبوو.

١٨ – فەرمانڕەوا نابێ هێزەکانی بباتە گۆڕەپانی شەڕ تەنها لەبەر پاداشت ، هەروەها فەرمانڕەوا نابێ بچێتە شەڕێکەوە لەبەر تووڕەبوونێک .

١٩ – گەر لە بەرژەوەندیت بوو پێشڕەوی بکە گەرنا لە شوێنی خۆت بە.

٢٠ – تووڕەبوون بە درێژایی ڕۆژ هەر وا نامێنێتەوە دەگۆڕێ بۆ خۆشی.

٢١ – کە پاشایەتیەک تەفرو تونا دەکرێت ناتوانرێ وەک خۆی لێ بکرێتەوە مردووەکانیش زیندو نابنەوە.

٢٢ – کەواتە فەرمانڕەوای زانا وریایە ، فەرماندەی گشتی بە تەواوی بە ئاگایە، ئەوە تەنها ڕێگای هێشتنەوەی وڵاتە لە دۆخی ئاشتیدا .

# ١٣- بەکار هێنانی سیخوڕ

١ – کۆکردنەوەی سەد هەزار سەربازی پیاوان ، بردنیان بۆ دوور بۆ مانۆری جەنگی ، زیانی زۆر لە گەڵ دەکەوێت و سەرچاوەیەکی زۆری وڵات دا دەچۆڕێ، تێ چووی ڕۆژانەی دەگاتە هەزار ئۆنس لە زیو ، هەراو هوریاو ئاژاوە لە دەرەوەو ناوەوەی وڵات بڵاو دەبێتەوە، سەربازان لە هیلاکیدا دەکەون بە هۆی ئەو ڕێگا دورانە، زیاتریش دەناڵێنن بچنە ناو خاکی دوژمنەوە. هەزاران خێزان زیان مەند دەبن لە کارو کردەوەو ڕۆزیان .

٢ – سوپا نەیارەکان ئەشێ چەندین ساڵ لە شەڕدا بن دژی یەکتری ، هەر لایەکیان لە ململانێدایە دژی ئەوی تر بۆ بەدەست هێنانی سەرکەوتن ، لەوانەیە لە ڕۆژێکدا ئەوە ڕو بدات، پشت گوێ خستنی دۆخی دوژمن هەر لەبەر ئەوەی چەند ئۆنسێک زیو خەرج نەکرێ بۆ کڕینی سیخوڕ ، بەوپەڕی نامرۆڤایەتی هەژمار دەکرێت.

٣ – ئەوە ڕەفتاری فەرماندەیەکی کارامە نیە ، یارمەتی فەرمانڕەواکەی

نەدات و سەرکەوتنیش بەدەست نەهێنێ.

٤ — بەو جۆرە ئەوەی وا دەکات فەرمانڕەوایەکی داناو فەرماندەیەکی سەربازی کارامە بهێنێتە ئاراوە تا گورزی بەهێز بوەشێنێ و سەرکەوتن بە دەست بهێنێ ، کە پیاوە ئاساییەکان ناتوانن ئەنجامی بدەن ، ئەوە هەبوونی زانیاری پێشترە لەسەر دوژمن.

٥ — ئەو زانیاریانە بە نوشتەو پاڕانەوە لە خوداوەند دەست ناکەون ، لە شارەزاییەکانی چەند ساڵەو پێش بینی و ئەستێرە ناسی دەست ناکەون .

٦ — جوڵانەوەو نیازی دوژمن تەنهاو تەنها لە کەسانی ترەوە دەست دەکەون.

٧ — پێداویستی بەکارهێنانی سیخوڕ ئەکرێتە پێنج بەشەوە:

١) سیخوڕەکانی ناو خەڵک ،

٢) سیخوڕەکانی ناوەوە،

٣) سیخوڕە هەڵگەڕاوەکان ،

٤) سیخوڕە گومڕایی کەرەکان ،

٥) ئەو سیخوڕانەی بە زیندوویی دەمێننەوە.

٨ — کاتێ ئەو ٥ جۆرە سیخوڕیە بەیەکەوە کار دەکەن نهێنیەک نا درکێندرێ، ئەوە باشترین ڕێکخستنە هەواڵ گریەکانە کە گرنگی پێ دراوە لە لایەن فەرمانڕەواوە.

٩ — بەکارهێنانی سیخوڕەکانی ناو خەڵک لە خزمەت گوزاریەکانی گەڕکەکاندا.

١٠ — بەکارهێنانی سیخوڕی ناوەوە واتە کەڵک وەرگرتن لە ئەفسەرانی سوپای دوژمن .

١١ — بەکارهێنانی سیخوڕە هەڵگەڕاوەکان واتە بەدەستەوەگرتنی

سیخوڕەکانی دوژمن و بەکارهێنانیان بۆ بەرژەوەندی خۆت.

١٢ – بەکارهێنانی سیخوڕە گومڕاییی کەرەکان ، تەنها هەندێ کاری تایبەت جێ بە جێ دەکەن لەبەر چاوی خەڵک بۆ هەڵخەڵەتاندن، تا سیخوڕەکانی دوژمن بیان ناسن و بیان گرن و دان بنێن بە زانیاری درۆو دەلەسە لەژێر ئەشکەنجەداندا کە زانیاریەکان بریتیە لە چاوو ڕاوو درۆو دەلەسە.

١٣ – ئەو سیخوڕانەی لە ژیاندا ماون ئەوانەن کە گەڕاونەتەوە بە زیندوویی لە سەربازگەکانی دوژمنەوە و هەواڵی ڕاستیان پێیە.

١٤ – لە کاروباری سوپادا ، گرنگ ترین شتێک پەیوەندیە نزیکی و دڵسۆزیەکانە لەگەڵ سیخوڕەکاندا ، نابێ هیچ شتێک بە ئەندازەی پاداشتی سیخوڕەکان بەخشندە تر بێت ، زۆر بە نهێنیەوە مامەڵە لەگەڵ سیخوڕدا بکرێت لە پێناو پاراستن و پاراستنیاندا.

١٥ – ناتوانی سیخوڕێک دامەزرێنی کەڵکی هەبێت گەر ژیرو هوشیار نەبێت.

١٦ – ناتوانرێ بە سەرکەوتوویی کاروباری سیخوڕان بەڕێوە ببرێ بەبێ پیشاندانی نیاز پاکی و دروستی.

١٧ – بەبێ کارامەیی هوشیاری و بیرکردنەوە لە ڕاپۆرتی زانیاریەکان کە سیخوڕەکان داویانە ، کەسێک ناتوانێ بە تەواوی دڵنیابێ لە دروستی زانیاریە هەواڵیەکان .

١٨ – وردوو کارامەبە ، سیخوڕەکان لە هەموو کاروبارێک بەکار مەهێنە.

١٩ – ئەگەر زانیاریەک دزەی کرد بۆ هەر سیخوڕێک پێش لەدەست دەرچون ، کوشتنی ئەو سیخوڕەو ئەوانەی ئەو نهێنییەیان گواستۆتەوە.

٢٠ – لەگەڵ ئەوەی ئامانج تێکشکاندنی دوژمنە یا داگیرکردنی شارێکە یا کوشتنی کەسێک ، پێویستە لیستی گشت ناوەکان بزانرێ لە یارمەتی دەران

**و کارکەران و پاسەوانانی فەرماندەی گشتی ، سیخوڕەکان جەخت بکەنەوە لە دروستی ناوەکان.**

**٢١ – پێویستە لە سیخوڕەکانی دوژمن بگەڕێین کە هاتوونەتە ناومانەوەو بیاندوزینەوەو بەرتیلیان بدەینێ و دووریان بخەینەوەو نیشتەجێیان بکەین لە شوێنی خۆش تا هەڵگەڕێنەوەو ئامادە بن کار بۆ ئێمە بکەن.**

**٢٢ –لەو زانیاریانەی لە سیخوڕە هەڵگەڕاوەکان دەستمان کەوتووە ئەتوانین سیخوڕی ناوچەییمان دەست بکەوێ و بیانخەینە کارەوە.**

**٢٣ – بە پێی ئەو زانیاریانەش ئەتوانین زانیاری درۆزنانە بە سیخوڕە گومڕاکەرەکان بدەین تا بیگەیەنن.**

**٢٤ – لە کۆتاییدا بە پێی زانیاری بەدەست هاتوو لەگشت جۆرە سیخوڕەکان دەتوانین سوود لە دەستەیەکی ستراتیژیان وەربگرین لە ئەرکی دیاری کراویاندا.**

**٢٥ – نیاز لە سیخوڕ بە هەر ٥ جۆرەکەیەوە بەدەست هێنانی زانیاریە لەسەر دوژمن ، بۆیە دەبێ مامەڵەی ڕێزو بەخشندەییمان لەگەڵیان هەبێت.**

**٢٦ – وەک نموونە ، مێژووی کۆن بۆمان دەگێڕێتەوە ناودار بوونی نەوەی ین بە هۆی *ئی چی* کە خزمەتی *میسیای* کرد ، هەروەها ناودار بوونی نەوەی *تشوو* بە هۆی *لو یا* کە خزمەتی *ین ی* کرد .**

**٢٧ – کەواتە هەر فەرمانڕەوایەکی زانا و فەرماندەیەکی وا هەواڵگریەکانی سوپا بەکار دەهێنن بۆ کاروباری سیخوڕێ. ئامانجی زۆر گەورە جێ بە جێ دەکات . سیخوڕەکان زۆر گرنگ ترن لە توخمی ئاو ، چونکە توانای سوپا لەسەر ئەوان وەستاوە بۆ جوڵان .**

**تەواو**